عەبدوڵڵا قەرەداغی
(مەلا عەلی)

# ڕاگوێزانی کورد لە مێژوودا

# ڕاگوێزانی
# کورد لە مێژوودا

عەبدوللا قەرەداغی

( مەلا عەلی )

سلێمانی ٢٠٠٤

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە ( ۲۷۸ )

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

# ڕاگوێزانی کورد لە مێژوودا

بابەت: مێژوویی
نووسینی: عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەل)
تایپ و مۆنتاژو دەرهێنانی هونەری: نووسەر
چاپی: یەکەم / سوێد
چاپی: دووەم / سلێمانی
تیراژ: ۱۰۰۰ دانە
ژمارەی سپاردن: ٤١٧ ی ٢٠٠٤



www.sardam.info

« ١ »

# كوردستان

کوردستان یەکێکە لە کۆنترین ئەو جێگایانەی کە یەکەمین کۆڕ و کۆمەڵی ئادەمیزادی تێدا نیشتەجێ بووە، وەکو خوزستان و نێوان دوو ڕووبار، زەوی کوردی کوردستان ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئاسیای ڕۆژئاوا، یەک وڵات پێک ناهێنێت، زەوی کوردستان دابەش بووە بەسەر ئێران و تورکیا و عێراق و سوریا. ووشەی کوردستان باوەڕپێکراو نییە لە ڕووی قانوونی دەوڵەتەوە، بەکار ناهێنرێت لە نەخشەو پەرتووکی ئەتڵەسیدا، کوردستان دەکەوێتە هێڵی درێژی ٣٠-٤٠ پلە لە ڕۆژهەڵاتەوە ٣٧-٤٨ پلە لە باکورەوە.

## سنووری کوردستان:

لەبەر ئەوەی کوردستان دابەش بووە هەر لایەش بۆخۆی لێی کەم کردۆتەوە،ئەوانەی لەسەر کورد و کوردستانیان نووسیوە ئەیخەینە ڕوو: نەخشەی کوردستان زیاتر شێوەی لاکێشی هەیە.

● ئایەتوڵلا مەردۆخی ئەڵێت: ڕووبەری کوردستان . . . ١٣٥کم٢یە.
● جەلال تاڵەبانی لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی . ٩,٦٥ . ٤کم٢یە.
هەندێکی کە ڕووبەری کوردستان بە . ٤٥ هەزارکم٢ لە قەڵەم دەدەن.
● دکتۆر قاسملو لە کتێبی: کوردستان و الاکراد، ڕووبەری کوردستان بە . ٩,٦٥ . ٤ کیلۆمەتری دووجا، دائەنێت و درێژی کوردستان لە باکوورەوە بۆ باشوور بە . . . ١ کیلۆمەتر و پانتایی تێکڕای بە . . ٢ کم لە بەشێکی باشوورییەوە و لەباکوورەوەزیاتر نەبێت.
● دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی لە کتێبی شۆڕشی کوردستانی عێراقدا پێوانەی کوردستان بە . . . . ,. . ٥ کیلۆمەتری دووجا دائەنێت.
● حمدالله مستۆفی نووسیویەتی کوردستان ١٦ ویلایەتە، لەگەڵ عێراقی عارەب و خوزستان و عێراقی عەجەم و ئازەربایجان و دیاریەکردا هاو سنوورن.
● ئەدمۆنس لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی: « کورد، تورک، عەرەب » نووسیویەتی باکوری کوردستان بە هێڵێکی نێوان یەریڤان و ئەرزروم و ئەرزنجان دیاری کراوە، ئەو خەتە بە دەوری مەرعەشدا هاتووە و گەیشتۆتە حەلەب، لە خوارو و رۆژ ئاواوە لەو تەپۆلکانە دەرچووە و کە لە ڕێگی ڕووباری دیجلەدان و لە دوایدا بە لای شاخی حەمرێندا دەکشێتەوە تا سنووری نێوان عێراق و ئێران دەڕوات، لە ڕۆژهەڵاتەوە بە کرماشان و سنە و سەقز و مەهاباد و ورمێ و خۆی و ماکۆدا، واتە بەشە کورد نشینەکەی ڕۆژئاوای ئێران، تێ ئەپەڕێت و بەرەو خوارووی ڕۆژئاوای یەریڤان دەڕوات.
● لە دائیرەی مەعاریفی ئیسلامیدا هاتووە: کوردستان سەر زەوییەکی بەرینە کە درێژاییەکەی لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە لورستان تا سەرووی ڕۆژئاوای مەلاتیە . . ٦ میلە و پانایەکەشی . ١٢-. ١٥ میل ئەبێت، پانترین جێگای لە نێوان موسڵ و ئەراراتدایە کە نزیک بە . ٢٥ میلە.

● قاموسی اعلام چاپی ئەستەمبول ساڵی ۱۸۹٦، کە ئەمش تەنها سەرچاوەیەکە لەکاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەست نیشانی ویلایەتی کوردستانی کردووە کە درێژی خاکی کوردستان ۹۰۰ کیلۆمەتر و پانیەکەی لە نێوان ۱۰۰-۲۰۰ کیلۆمەتری داناوە.
مەردوخ لە کتێبەکەی خۆیدا سنووری کوردستان وا دیاری دەکات:
کوردستان، لە باکورەوە ئەرمەنستانە، لە رۆژهەڵاتەوە ئازربایجان کە عێراقی عەجەم و خوزستان کێوەکانی زاگرۆس لەم پارچەیەن، لە خوارویەوە ئەگاتە عێراقی عەرەب، لە رۆژئاواشەوە زەویەکانی ئاسیای بچوک ئەگرێتەوە، ئایەتوڵلا دیسان لە لێکۆڵینەوەکانەوە دەگێڕێتەوە کە کوردستان لە باکورەوە کێوەکانی ئەرارات و لە رۆژهەڵاتەوە سنووری خوزستان و فارس و زنجان و ورمێ و ماکۆ، لە خوارەوە لای سەرووی بەغدا، عێراقی عارەب و لە رۆژهەڵاتی چۆمی فورات تا نزیک بەغدا دەگرێتەوە، بەم جۆرە بەشێک لە ئەرزرۆم و هێندێک لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ئاسیای بچوک و ئازربایجانیش بە خاکی کوردستان ئەژمێرێت.
کورد بە واتای زانستی یەک ئەتەوە پێک دێنێ: یەک نیشتمانی تایبەتی، یەک زمانی تایبەتی، پەرە سەندنی مێژووی تایبەتی، پەیوەندی ئابووری ناوخۆی تایبەتی، ئەرهەنگ و هەستی ئەتەوایەتی تایبەتی ناوخۆی هەیە، کوردستان واتە نیشتمانی کورد لە چەند لایەکەوە. پێوانەی جۆراوجۆریان بۆ نووسیوە،هەندێکی ئەخەینە روو :
لە رووی جوگرافیەوە بەسەریەکەوەیە، لە رووی سنووری سیاسیەوە بە شێوەیەکی سەرەکی لە نێوان تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا، دابەشکراوە. لە هەر یەکێک لەو وڵاتانەدا بە ئارەزووی خۆیان سنووریان بۆ داناون. لە تورکیا بە کوردستانی تورکیا ئەڵێن ئەناتۆلی رۆژهەڵات، کوردەکانی کوردستانی تورکیا هەموو لە ناوچەی رۆژهەڵاتی وڵات نیشتەجێن،

ناوچەی کوردستان لە بەشی باکور ویلایەتی دیورغی، ئەرزروم و قارسی.
لە ناوچەی ئەرزروم کوردەکان بە تایبەتی لە بەشی رۆژھەلاّت و باشوری رۆژھەلاّت نیشتەجێن، ھەروەھا لە بن کێوەکانی بالی رۆژئاوای ئەراراتو ناوچەی قاغیزمان و توزلوکە لەوێندا ھەن، لە بەشی خۆرئاوای ناوچەکە کوردەکان نیشتەجێن و بە ویلایەتی سیواس و ناوچەی قانغال و دیورغی گشتووە، ھەموو دانیشتوانی رۆژھەلاّت و باشوری رۆژھەلاّتی ئەم ناوچەیە ھەموو کوردن و ھەندێک لەو کوردانە کە کۆچیان پێکردوون لە سلیسیا و لە باشوری ئەنقەرەدا ھەن، وە لە شارە گەورەکاندا ئستەمبول، ئەنقەرە و ئەزمیر ئەژین، ١٧ ویلایەتی کوردنشین لە تورکیادا ھەیە کە بریتین لە:
باکوری رۆژھەلاّتی ویلایەتی ئەرزنجان، ئەرزروم، قارس، وە لە ناوەند و رۆژئاوا و رۆژھەلاّت. لە باکور بە باشوری ویلایەتی مەلاتیە، تونجلی، ئالازیغ، بینگول، موش، قاراگوزە ئاغدی « پاشان ئادی یمان، دیار بەکر، سیرت، بتلیس و وان، ویلایەتەکانی باشوری ئورفە، ماردین، جزلامرگە « ھەکاری » کلیە، ئەمەش ھەموری تێکڕا کورد نشینن، کوردەکانی تورکیا لە بەشی رۆژھەلاّتیانەوە بە برا کوردەکانی بەشی ئێران بەیەکەوە بەستراون.

## کوردی کوردستانی ئێران

ئێران لە سەدەی ١٦دا ھەمەدان و لورستانیان لە کوردستان جیاکردەوە، تەنھا ناوی کوردستانیان بە ناوچەی ئەردەلان سنە « سنندج » وتووە کە ناوەندی ئەردەلان بووە.لە ئێران کوردەکان لە باکوری رۆژئاوای ولاّتدا دەژین، کوردەکانی پارێزگای ئازربایجانی خۆرئاوا لەم پارێزگایانەدا لە بەشەکانی رۆژئاواو باشووری دەریاچەی ئورمیە کورد نشینن، لە خۆرئاوای دەریاچەی ماکۆ، قتور، شاپور، وەلە باشوری دەریاچەوە مھاباد،

پیرانشەهر، نەغەدە، شنۆ، تکاب، قروە، دیواندەرە، بۆکان و سەردەشت.
بەشەکەی پێی ئەڵێن کوردستان « سنە یان سنندج » ئەو ناوچانەی سەر بە سنەن، سەقز، بانە بیجارە گروس »، مەریوان، پارێزگای جێنشینی کورد پارێزگای کرماشانە، جگە لەمانە کوردێکی زۆر لە نیشتمانی خۆیان دوورکەوتونەتەوە وەک لە خوراسان، بجنورد، فارس و کرمان دەژین و لە شارە گەورەکاندا تەبریز و حومە، تاران، بەشێکی زۆری کورد دەژین، وەلەبەشی کۆتایی رۆژهەڵاتی ئێران لەسەر سنوور تیرەیەکی گرنگی کورد دەژی لەویلایەتی بلوجستان.

## کوردی کوردستانی عێراق

لە عێراق بە ناوی باکورەوە ناوی ئەبەن، لە باکور و باکوری رۆژهەڵاتی ولاتدا ئەژین و ویلاتەکانی کوردنشین بریتین لە: دهۆک، ناوچەی زاخۆ، مزوری، جبر، عەمادیە، عەقرە، و لەبەشی چەپی ئەم ویلایەتەوە ناوچەی سنجار و شێخانە کە یەزیدین، وە کەرکوک و هەولێر و سولێمانی، وە لە ویلایەتی دیالەدا ناوچەی خانەقین و مەندەلی. ئەم ناوچانەی کورد نشینی عێراق لەگەڵ کوردەکانی ئێراندا کە لە بەشی خۆرئاوای زاگرۆسدا هەن هاوسنوورن وە لەملاشەوە لەگەڵ برا کوردەکانی تورکیا و سوریادا هاوسنوورن، کوردی بەغدا و موسڵ بەقەد یەکن و زۆرن.

## کوردی کوردستانی سوریا

لە سوریا رەگەزپەرستەکان بە ناوی جزیرەوە ناوی ئەبەن، لە سوریا « کوردەکان لە باکوری ولاتدان » لە بەشی باشور هەن و لەگەڵ کوردەکانی تورکیا هاوسنوورن، ناوچەیەکی کە لە کورداغ بە پانای ٤.

کیلۆمەمەتر دەست پێدەکات تا ڕۆژهەڵاتی فورات لە جێگەیەکدا کە ئەو ڕووبارە نزیک جەدابلوس دێتە خاکی سوریاوە درێژەی پێ ئەدات.ناوچەیەکی کە بە درێژایی ۲۵ کیلۆمەتر و پانی ۳کم لە جزیرەدایە ئەمانەش ناوچەی رأس العین لە باسیە، عامودا، قامیشلی، عین دیوادوە، دیرک، ئەم ناوچانە لە نێوان دیجلە و ڕوباری خاپوور کە بەشێکە لە فورات ئەم بەشە لە خاکی سوریادا، بەشێوەی دەنووکی مراویە، کە لەوانە کوردەکانی سوریە و عیراق و تورکیە، هەرسێ لایان بەیەکەوە بەستراون، جگە لەوانە لە شاری دیمشق و حەمات و حەلەب هەزاران ماڵی کوردی تێدا دەژی.

لە سۆڤیەت لە ئەرمەنستان ۳۵ دێ و لە ئازربایجان ۲۵ دێ لە ناوچەی کاباجان، لاچین و کۆباتلی کورد نشینەو ئادیستوا، زۆری کورد لە شارەکانی یەریڤان، باکۆ و لە کۆماری گورجستان و لە شاری تەفلیس.

۳٦ هەزار کورد لە شورەوی دەژین و ئەڵێن لەو ژمارەیە زۆر زۆرترە بەشێکی بڵاوەیان پێکردووە بە پێی تەخمینی ئەم دواییەی کۆنفرانسی کوردەکانی سۆڤیەت ئەڵێن نیو میلیۆن کورد هەیە لە شورەوی. لە خوراسان یەک میلیۆن کورد ئەژی و ۱٦۰۰ گوندی کورد نشین هەیە و لە شارەکانی بجنورد و جاجرم و سەبزەوار و نیشاپور و شیروان و قوچان و مەشهەد و دەرگەز و کەلاتی نادر دا ئەژین و شێوەی زمانی هەموشیان کرمانجی سەروو وە جگەلەوانەش ۵۰۰۰ خێزانی ئاوەکو نیستا هەر بە شێوەی کۆچەری و چادرنشین ئەژین. ئەمرۆ گەورەترین مەڵبەندی کۆبوونەوەی کورد لە خوراسان شاری مەشهەدە. وەلە ناوچەی گیلان ٦ دێ هەن کاتی خۆی نادر شا بردونیەتە ئەوێ بۆ بەرهەڵستی ڕووسەکان.

د.عەزیز شەمزینی لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان دەربارەی سنوری ئەتنۆگرافی کوردستان، سنووری

کوردستان لە رۆژئاوادا لە کورداخەوە « سوریا » دەست پێدەکا و بە ناوچەکانی کیلس، مەراش، بستان و لیویریک دا تێدەپەرێ و ڕوو ئەکاتە باکوور تا ڕووباری کیلکیت و مارایە و بەرەو دەریای ناوەراست، لە رۆژهەلاتیشەوە لە شارەکانی بایبور دونولتییەوە دەست پێدەکات بە خوارووی رۆژهەلاتی فارس و لێواری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێدا تێدەپەرێ،لورستان و ناوچەی بەختیاریەکان دەبڕێ و تا دەگاتە سنەو کرماشان.

لە باشوورەوە لە لورستانەوە دەست پێدەکات و ڕوو دەکاتە باکوری رۆژئاوا بە خانەقین و کفریدا تێدەپەرێ تا دەگاتە نزیک چیای حەمرین لەوێ ڕوو دەکاتە رۆژئاوا بە ناوچەکانی خوارووی چیای شەنگار دا تێدەپەرێ، فورات دەبڕێ و لە شاری تەرابلس و خوارووی کورداخ نزیک دەبێتەوە تا لە سەرووی ئەسکەندەرونەدا دەگاتە دەریای ناوەراست. نیلی نیکیتین لە کتێبەکەیدا، کورد و کوردستان، دەڵێت:

ناوی کوردستان بە واتا خاکی کوردستان، ناوی یەک ولاتی سەربەخۆ، سنووری تایبەتی، سیاسی خۆی نییە، هەموویان دارای یەک بنەرەت و نەژادن. ئەم ناوەش لە سەدەی ١٢وە لە زەمانی فەرمانرەوای سوڵتان سنجردا پاشا گەورەی سەلجوقیەکاندا پەیدا بووە و لە شانزە زیلایەت پێک هاتووە، کوردۆ بە زمانی ئەکەدی و ئاشوری بە واتە بە توانا و پاڵەوان و کەردۆ بە واتە بەهێز بوون. کوردوخوی کۆکردنەوەی کەردوخ، بەزمانی ئەرمەنی، کردوخ، کرت وەلی دراوسێی خوارووی خالد و ئۆرارتو بوون.ئەرمەنیەکان بەو بەشە کوردانەیان وتووە کردوخی، عارەب وتویانە باکردا.

بە قسەی ئەسترابوون ئەڵێت کێوەکانی کوردەکان لە دیاریەکرەوە تا موش درێژ بۆتەوە، ئەم ناوانە هەبوون، تەنها ئەوە نیە کە گەزەفون ناوی

بردووە، واتە پێش گەزەفون ئەو ناوانە باسکراوە. لە نێوان سەدەی نۆی پ.ز تا شەشی پ.ز وڵاتێک کە پاشان بووە ئەرمەنستان لە ژێر فەرمانڕەوای خالدی و ئورارا تودا بووە. یەکەم نووسەر کە لە کوردستاندا ناوی بردووە حمداللە مستوفی قەزوینی بووە لە سەدەی چواردەی زاینیدا و لە ٧٤٠ک لە کتێبی « نزهە القلوب »دایە ئەم ویلایەتە لە رۆژهەڵاتەوە بەستراوبوو بە عێراقی عەجەم، لە باکورەوە بە ئازربایجان، لە رۆژئاواوە بە عێراقی عەرەبەوە، لە باشورەوە بە خوزستان، کوردستان ببووە ١٦بەش کە هەریەکە ئرخێکی خۆی هەبووە.

ئالانی، ئالی شتەر، بەهار، خەفتیان، دەربەندی تاج خاتوون، دەربەندی زەنگەنە، دذبیل، دینەوەر، سولتان ئاباد= چەمچەماڵ، شارەزور. بە قسەی « یاقوت حەمەوی » دروست کەری ئەم شارە « زور بن زوحاک » بووە کرماشان پێشتر پێیان وتووە کرمسێن، کرند و خوشان، کەنگور، ماهی دەشت یان مای دەشت، هەرسێن، وستام.بەهار پایتەختی کوردستانی ئێران بووە تا هاتنی مەغول.

لێرەدا نیەتکێتن باسی جوگرافیای کوردستان لەسەر نووسینی مینورسکی دەکات لە کتێبەکەیدا ل ٧٨. جوگرافیای سروشتی کوردستان لەسەر کتێبی کوردەکان، مینورسکی نووسیویەتی بۆ ئەوەی جوگرافیای ئەم بەشە لە ئاسیادا باشتر تێبگەین، ئەبێت لایەنگری دوو خاڵی گرنگ بکەین:

- کێوی ئەرارات
- کەنداوی ئەسکەندەرونە

لە باشوری ئەراراتەوە بە درێژایی ٢ هەزار کیلۆمەتر، ئەم کێوانە وەک یەک زنجیرەی بەیەکەوە بەستراو راکێشراو دەکشێن. ئەم کێوانە لەسەرەتاوە رێک لە باکورەوە بە لای باشوردا درێژ بونەتەوە، پاشان چەند لقێکی لێ

ـەیدا ئەبینێت بەرەو تەنیشتی باشوری رۆژئاوا، بە واتە بۆ لای کەنداوی ـارسی درێژ دەبێتەوە.

ئەرارات ناوەندی ناوچە کێوەکانی فراوان و زۆرن کە شێوەیان « ئەوانی » و چوار سەریان بریتین لە: سەری باکور لە گۆڕێ، سەری باشور ـە جۆلەمەرگ، سەری رۆژهەلاتی لە شوشە، سەری خوارۆش لە بای بورت. ـە نێوان ئەرارات و جۆلەمەرگە کێوەکانی کوردستان بەرزایی زۆریان لێ ـروست بووە، لە باشوری جۆلەمەرگەوە خاکی ئێران دەست پێدەکات، کە ـەو کێوانەی کوردستان بەسەر دەشتەکانی ئاشوردا ئەڕوانێت.

دەریاچەی ورمێ لەگەڵ جێگا بەرزەکانیا لە رووی دەریاوە میاندواو ١٢٨. مەتر، مەهاباد . . ١٣٠. مەتر، شنو . . ١٤ مەترە، ورمێ ١٣٢. مەترە، دەریاچەی ورمێ ١٢٢. مەترە. ئەو کێوانەی کە کەوتونەتە ـێوان ئەم دوو دەریاچەوە، وان و ورمێ، ناوی وەک یەکیان نیە و ئەو کێوانەی لە نێوان دوو رووباردا هەن بەناوی زاگرۆسە کۆنەوە ناو دەبرێن، ـەم ناوانەش وا دەردەکەوێت کە یۆنانی بن، ئەگەر رووەمان بەلای ئەسکەندەرونەدا وەرگێڕا دەبینین لە ماوەیەکی کەمدا لە باکوری ئەم خاڵەوە چەند کێونێک دەرنەکەون ئانتیتۆرۆس، ئەم بەشە بە هێلێکدا دەڕوات بەلای دەریای رەشدا. تێکرا لە سێ لق لە بەشی باکووری رۆژهەلاتەوە درێژ دەبێتەوە کە بریتیە لە تورۆس باکوری، تورسی ناوەند، تورسی باشوری ئەرمەنستان.

ناوچەی جێگای دانیشتوانی کورد لە چوارچێوەی سروشتی شاخ و دۆڵەکاندا لوتکەی بەرز و پانتای و بەرزایی لوتکەی سەختەکان دۆڵی قوڵ و فراوان جێگەی میللەتی کوردە، هەر لە سەرەتاوە ژیواری خۆیانیان لەو جێگایانەدا بریارداوە، لە مێژووی زۆر کۆندا و لە لقەکانی تورسی باشوری و خاکی کێوەکانی رۆخی چەپی رووباری دیجلە بە « درێژایی بۆتان و

خاپور و زابی گەورە ، ئەگەر بگەڕێنەوە سەرەتای مێژووی وڵاتی کوردی ئەوکاتە لە رۆژهەلاّت و باشور هەروەک و ئێستا لەو جێگایانەدا بوون، بەم پێیە جێگای ٣ ناوچە دانیشتوانی کورد بەم شێوە لە خاکە بەرزەکانی ئەرمەنستان، کوردستانی تورکیاوە کێوەکانی خۆرئاوای ئێران و بە درێژایی و پانتای سنووری عێراق و ئێران لە شارۆچکەی مەندەلییەوە لە رۆژهەلاّتی عێراق، پاشان هێلێک کە ئێران و تورکیا لەیەک جیا ئەکاتەوە تا کێوەکانی ئەرارات، لە باکورەوە تا پێ‌نی ئەو دیو قەفقاس، ئەرمەنستان و ئازەربایجانی شورەوی، هێلێک دەوری ئەرزروم تا باکوری ئێشان لە تورکیا لەسەر ئەوە. لە باشور، کورد تا دەوری دەشتی ئێوان دوو رووبار هەن.لە خۆرئاواوە سنوری ناوچەی دانیشتنیان بە شێوە گشتی تا فوراتە و بە شێوەیەکی راستتر تا رووباری قەرەسو ، لەسەر خاکی ئاسیای بچوک بە قولاًیی ئەو ناوچەیە لە باشووری رۆژهەلاّتی سیواس هەبووە، هەروەها لە جزیرە بچوکەکان لە نزیکی قونیەوە سلوکیە « سیلیس » تا دەریای مێدترانە نفوسیان هەبووە لە رۆژهەلاّتیشەوە کوردە ئاوارەکان ئەوانەی شا عەباس کۆچی پێکردوون، لە خوراسان هەن، وئەوانەی نادرشا لە ساڵی ١٧٤٧ز ڕاپگواستوون لە دەورویەری قەزوین و وڵاتی فارسن لە نزیک کیالون ئاب دوو، هەروا لە ناوچەی مازندەرانیش هەن، بەشێوەی گشتی دەتوانین بڵێین کە کورد و کێو لەیەک جیا نابنەوە.

ژمارەی گەلی کورد. قسەی زۆری لەسەرە، ئەوانەی ئەیان چەوسێننەوە زۆر بە کەمیان باس دەکەن و بە هەموو توانایانەوە لێیان کەم دەکەنەوە، زۆرجار بۆ ئەم مەبەستە هەندێک شاروو شارۆچکەیان بە کورد دانەناوە، لەم ڕووەوە سێ خشتە ئەخەینە ڕوو : لەگەڵ ڕووبەری کوردستان کە هەر یەکە جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوانی کەدا هەیە.ئەم خشتەیەی خوارەوە لە لایەن دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، لە کتێبی شۆڕشی کوردستانی عێراق

بەشی یەکەم لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ وە تا ساڵی ١٩٦٣ لە لایەن کۆمیتەی بەرگری لە مافەکانی گەلی کورد، ئەم خشتەیە هێنی ساڵی ١٩٦٣یە.

| | پێوانەیکم٢ | کوردستان بەکم٢ | سەرژمێرخەڵکەکە | سەرژمێری کورد | ڕێژەی کورد |
|---|---|---|---|---|---|
| تورکیا | ٧٦..... | ٢٢..... | ٢٦,......... | ٦,........ | ٪٢٣ |
| ئێران | ١,٦٤٨,.... | ١٨..... | ٢١,......... | ٤,........ | ٪٢١ |
| عێراق | ٤٤..... | ٨..... | ٦,٥........ | ٢ ....... | ٪٣٠ |
| سوریا | ١٧..... | ٢..... | ٥......... | ٤...... | ٪٨ |
| سۆڤیەت | | | | ١٥..... | |

هەروەها بەپێی نەخشەی ناوچەیی لێکۆڵینەوەی کوردی لە پاریس ......٥کم دوجا کەلە ساڵی ١٩٤٩ دا دیاریکراوە بە مەزەندەی ئامال ورامبو .....٥٢کم دوجایە.

بەپێی ئەم خشتەیە پێوانەی کوردستان هەمووی ......٥ کم دووجایە.و دانیشتوانی نزیکەی سێ هێندە زیادی کردووە.کەواتە بە مەزەندە کورد ئەمڕکە نزیکەی ٣٠ ملیون دەبێ.

خشتەی دووەم لە پەرتوکی کوردستان و الاکراد، دراسە سیاسیە و اقتصادیە، دکتور عبدالرحمن قاسملو

| | رووبەر بەکم٢ | ژمارەی دانیشتوان لە ١کم٢ | ژمارەی دانیشتوانی کوردستان | ژمارەی کورد لە کوردستان | ژمارەی کورد لە وولاتدا |
|---|---|---|---|---|---|
| تورکیا | ٧٧٦,٩٨٠ | ٣٣ | ٥,١....... | ٤,٦...... | ٤,٩...... |
| ئێران | ١,٦٤٠..... | ١٢ | ٣,٥...... | ٣,....... | ٣٣.,.... |
| عێراق | ٤٤٤,٤٤٢ | ١٥ | ١,٦....... | ١,٤...... | ١,٥٥..... |
| سوریا | ١٨٤,٤٧٩ | ٢٢ | | ٤...... | |

| | ناوچەی کورد بەکم٢ | دانیشتوان لە کوردستاندا لە ١کم٢ | رێژەی سەدەیی کوردەکان بە بەراورد لەگەڵ دانیشتواندا | رێژەی دانیشتوانی کوردستان لەگەڵ هەمور دانیشتواندا | رێژەی سەدەی رووبەری کوردەکان بە رێژەی رووبەری هەمو وولاتەوە |
|---|---|---|---|---|---|
| تورکیا | ١٩٤,٤.. | ٢٦ | ١٨ | ١٩ | ٢٥ |
| ئێران | ١٢٤,٩٥. | ٢٨ | ١٦ | ١٧ | ٧,٥ |
| عێراق | ٧٢,... | ٢٢ | ٢٢ | ٢٣ | ١٦ |
| سوریا | ١٨,٣.. | ٢١ | ١٠ | | ١١ |

کوردەکان لە ٨٥٪ پێک دێنن لە دانیشتوانی کوردستان، ئەوانی کە ......٤ تورک و ......٣ ئازەربایجانی و ......١٥ فارس و ......٢٥ عەرەب و ......٢ لە تیرەو قەومەکانی کە وەک تورکمان، ئاشوری، ئەرمەن.

بەراوردکردنی لەوکاتەوە تا ئێستا نزیکەی سێ هێندە دانیشتوانی زیادی کردووە وە لە کتێبی چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی کوردستانی ئێران ساڵی ١٩٨٥ ئەڵێت پێوانەی کوردستانی ئێران . . . ,١٢٥کم دووجایە و ژمارەی دانیشتوانی . . . . ,. . ٧ ملیۆن کەسە.

خشتەی سێیەم لە پەرتوکی « کرد در دائره المعارف اسلام ـ ترجمە اسماعیل فتاح قازی »

| | نیکیتین | بروک | قاسملو | وانلی | ئەدمۆندز |
|---|---|---|---|---|---|
| تورکیا | ٤,٥ | ٢,٥ | ٤,٩ | ٦,٦ | ٣,٢ |
| ئێران | ١,٥ | ١.٨ | ٣,٣ | ٤,٢٥ | ١,٨ |
| عێراق | ٥ | ٩ | ٥٥ | ٢, | ١,٥٥ |
| سوریا | ٥ | ٣ | ٢٥ | ٥ | ٣٢ |
| قەفقاس | ٢٥ | | ١٦ | ١٥ | ٨ |
| | ٧,٢٥ | ٥,٥ | ١٠,١٦ | ١٣,٥ | ٦,٩٥ |

١- نیکیتین، کرد ١٩٥٦- ٤٢

٢- اس.آی بروک قەومی هەکاری ١٩٥٨ - ٣٠

٣- د.قاسملو، کردستان ١٩٦٥-٢٣

٤- د. عیسمەت شریف وانلی کوردستانی عێراق ١٩٧٠-٣٠

٥- ی.جی ئەدمۆندز مجەلەی مێژووی بەرگی یەکەم ١٩٧١-٩٢

# شاخ و ڕوبار و دەریاچەکانی کوردستان

## • شاخەکانی کوردستان:

کوردستان تێکرا وڵاتێکی شاخاوییە. لە کوردستانی تورکیادا بەشە کێوەکانی توورووسی ڕۆژهەڵات لە قەراخی دەریای سپی ناوەڕاست بە پانایی جوگرافیی کەنداوی ئەسکەندەروونەوە ئەگرێتەوە، پاشان بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات درێژ ئەبێتەوە. لە باکووری مەرعەش ئەبێتە دووبەش و لەیەکتری دوور ئەکەنەوە. بەشی باکوور کە ناوی ئینگرداغ و نورداغە و بەرزایی ۳۰۹۰ میترە لەگەڵ کێوی ئاگری داغ بەیەک دەکەونەوە سەربەشە کێوەکانی مەنزوور کە بەرزایی ۳۰۸۸ میترە. مرکان و کارگاپارازی بەرزایی ۳۳۸۸ میترە. ئەمانە بەیەکەوە ئەبەسترێن و پاشان لار ئەبێتەوە بۆ زنجیرە شاخەکانی ئەراکس و ئەویش ئەبڕێت و لە کۆتاییدا ئەگاتە زنجیرە شاخەکانی ئەرارات.

بەشی دووەم بەشێوەی کەوانی لە باشووری مەلاتیەوە دەست پێدەکات و لەگەڵ کێوەکانی هاچرس کە بەرزایی ۲٦۳۹ میترە و ساسون

کە بەرزایی ۲۵۹۰ میترە تا باشووری مووش ئەروات و پاشان لەگەڵ کێوەکانی بدلیس و هەکاری کە بەرزایی ۳۶۳۰ میترە و سبلوداغ لەلای باشووری دەریاچەی وانەوە درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە کێوی جیبوداغ کە بەرزایی ٤۱۷۰ میترە. جگە لەوانە لە سنووری باکوورەوە چەند بەشە کێونێک بەرزاییان بەرامبەر بەیەکە لەوانە کێوی چەکماک. لە باشووری ئەرزرومەوە بەشە کێونکی ناگراوی پالند و دوکن داغ بەرزی ۳۱۲٤ میترە، بەلای باشووردا زنجیرە شاخی بن بنگوڵ هەیە، بەلای رۆژئاوادا بە بەرزایی تولجلی درێژ بوونەتەوە. لەم بەشەدا روباری فورات کە بەنێو بەردی بلورین و زۆر گەورەدا ئەروات داپۆشیوە، کە دۆڵی زۆر گەورە و سەختی لێ دروست کردووە و جێگای هاتووچۆی نییە.

لە باکووری مەلاتیەوە سەرچاوەی زۆر جوان لە یەکلا واتا باشووری رۆژهەڵاتی لازیغ بەرزاییەکەی ۱۰۲۰ میترە. لەلایەکەوە تا باکووری مووس ۱۵۰۰ میتر برپوبانە. لەم بەشەدا « ئاناتۆلی » بوومەلەرزەی یەک لەسەر یەک هەیە کە لە ساڵی ۱۹۳۹دا (۲۵) هەزار کەسی کوشتووە. هەروا لە ساڵی ۱۹٦٦ بوومەلەرزە لە وارتو و، لەساڵی ۱۹۷۱ لە بنگوڵ و گەنجی داوە.

لەبەشی باشوور کەوانە کێوەکانی تاروس ناوچەیەکی زۆریان گرتۆتەوە. نورفا بەرزاییەکەی ٥٥٠ میترە. دیاربەکر بەرزاییەکەی ٦٥٠ میترە لەویشەوە بەرزاییان وەک یەکە، کە بەرەو نێوان دوو روبار درێژ بۆتەوە. لەو بەشەشدا تەپەی خری ناگراوی قەراچەداغ بەرزایی ۱۹۱٥ میترە. زنجیرە کێوی توری عابدین، کە لە ماردین بەرزایی ۱۱۳۰ میترە، دەست پێدەکات و لە بەشی رۆژهەڵات بە کێوی بەرزتر (هاراکول-۲۹٤۳ م) و کێوی جودی (۲۰۸۹ م) کۆتاییان دێت. لە کۆتایی رۆژهەڵاتی تورکیا زنجیرە کێونێک هەن. دوو کێوی ئاراراتی گەورە و

ئاگری داغ بەرزی ٥٢٥٨ میترە. ئەراراتی بچووک بەرزیی ٣٩٢٥ میترە. لەم کێوانە چەند بەشە کێوێک جیادەبنەوە، بەشێک لەوانە بە دەورەی دەریاچەی وان دایە. کێوی تەندروک کە بەرزایی ٣٣١٣ میتر بەرزە. لە بەشی باکووری ئەم دوو کێوانە هەڵکەوتووە.

کێوی ئالاداغ ٣٦١٠ میتر و شاخی ئیزپریزداغ ٣٥٣٧ میتر بەرزە. لە باشووری واویران داغ بەرزایی ٣٥٥٠ میترە و هەروا لەناوە لوتکە کێوەکانی ساتاک هەن. لە بەشی باکووری دەریاچەی وان دوو کێوی ئاگرین هەن: کێوی سیپان کە بەرزایی ٤٤٣٠ میتر و کێوی غرود (غروت) کە بەرزایی دوندەکەی دەکات ٣١٤٠ میتر. لە بەرزایی ٢٥٥٢ میتری ئەم کێوەدا دەریاچەیەک هەیە ئاوەکەی شیرینە. دەریاچە کە ١٧٢٠ میتر لە رووی دەریاوە بەرزە. ئەم ناوچەیە بەرزترین ناوچەی کوردستانی باکوورە. بەشە کێوەکانی کە بە ئاراراتەوە بەستراون دەبن بەو کێوانەی لە باکوورەوە بەرەو باشوور درێژبوونەتەوە و لە نێوان دوو دەریاچەی وان و ورمێ دان و کوردستانی باکوور لە کوردستانی رۆژهەڵات جیادەکەنەوە. ئەم کێوانە بە بەرزایی ناوچەی هەرکی و هەورامان بەستراونەتەوە و لەوێوە بەرەو باشووری رۆژئاوا شۆڕبوونەتەوە، کە یەکەمین لوتکەی کێوەکانی زاگرۆس دروست دەکەن. شاخەکانی زاگرۆس بە دوو بەشی بەرامبەر بەیەک خاکی کوردستانیان تەنیوە. رۆژهەڵاتی شاخی زاگرۆس لە کوردستانی رۆژهەڵاتدایە و دوو زنجیرە کێوەکانی رۆژئاوایشی لە باشووری کوردستان دان.

هەروەک ئەدمۆندز دەڵێت ناتوانرێت بە ئاسانی ناو بۆ ئەم هەموو لوتکە و زنجیرە کێوانە دابندرێت، هەر چەندە لە هەموو جێگا و ناوچەکانی خۆیاندا دانیشتوان ناویان دەزانن و لە راستیدا لە هەموو شوێنێک ئەو لوتکە و شاخانە ناوی جۆربەجۆریان هەیە.

## ڕۆژهەڵاتی کوردستان:

چەند زنجیرە و بەشە کێوێک. جیاجیا و بەرامبەری یەک لە باکووری ڕۆژئاواوە بەرەو باشووری ڕۆژئاوا درێژبوونەتەوە. بەرزترین کێویان دانپرە کە بەرزاییەکەی ٣٧٤٨ میترە و لە نێوان سنووری سێ ناوەندی تورکیا و عێراق و ئێراندایە. پاشان سپیرەز و قەندیل یان کوگێز کە ٣٧٨٢ میتر بەرزە گەلاڵە ٣٣٦٤ میتر بەرزە. نەختێک دوورتر بەرەو ڕۆژهەلأت کێوی چلچەشمە ٣٤١٦ میتر بەرزە. ناوی کوردستانی ئێران زیاتر لەم کێوانەوە سەرچاوەیان گرتووە و بەرەو باشوور بە زنجیرە کێوی هەورامان (٣٢١٦ میتر بەرزە) و جێ لوکە (. . ٣٥ میتر بەرزە) هەن کە بە زنجیرە تا کێوەکانی لورستان و پشتکو درێژ دەبنەوە.

**باشووری کوردستان:**

لە باشووری ناوەندی تورکیا کێوەکانی جودی داغ و شێخان داغ و جلوداغ، لە نێوان ڕووباری فورات و زێی گەورەدا و، لوتکە کێوەکانی بێخێر و متینا و گارا بەرەو سنووری ئێران درێژبوونەتەوە. لەم بەشەی زێدا کێوەکانی سەری کوێر ناوا بەرزییان ٣٦٠٣ میترە و دۆڵە ڕەش ٣٤٤٩ میترە، خوارابتە ٣١٦٨ میترە. لە ناوچەی برادۆست نەگەرچی کێوەکانی سنوور بەرزن، وەک کێوی هەڵگورد ٤٠١٣ میترە، بەلأم وردە وردە بەرەوە شتەکان بەرزایی کێوەکانی کەم دەبنەوە. بۆ نموونە چیای هەندرێن بەرزایی ٢٧٩٣ میترە کەوتۆتە باشووری ڕۆژئاوای ڕەواندوز.

لە زنجیرە کێوەکانی کورەکاژاو، گوجار، کوکورە و ناسۆس لوتکەی زۆر بەرز هەن کە بەرزاییان لە نێوان ٢٩٥٠ تا ١٩٦٠ میترە.

بەشە کێوەکانی ئەزمیر و قەرە سیرەت بەرزاییان لە نێوان ١٨٧٠ تا ١٦٠٨ میتر نەبێت. لەنێو ئەوانەبشدا لوتکەی پیرەمەگروون کە لە باکووری ڕۆژئاوای سلێمانیە، ٣١٨٣ میتر بەرزە. لە بەرامبەریدا شاخی

بەرانان هەیە کە لەنێوان ١٧٣٩-١٤٧٧ میتر بەرزە.

لەبەشی رۆژئاوایەوە چیاکانی قەرەداغە کە بەرزایی لە ١٣٧٨-٢.١٧ میتر دەبێت. لەبەشی باشوورییەوە تونی باباعەرە کە ٣٦٥. پێ بەرزە. دیسان لەبەشی خۆرئاوای ئەویشەوە کێوەکانی حەمرین هەڵکەوتوون کە بەرزاییان ١٦٤. میترە. ئەم کێوانە لە باشووری رۆژهەڵاتەوە بۆ باکووری رۆژئاوا کشاون کە لە سیروانەوە تێدەپەرن و لە کۆتاییدا لە زێی بچووکەوە بە دیجلە دەگەن. شاخەکانی شەنگار بە درێژایی ٦٠. کیلۆمیتر و پانایی ١٥ کیلۆمیتر و بەرزایی ١٦٠.. میتر لە نێوان هەردوور رووباردان و تا رۆژئاوای موسڵ کشاون.

## ● ڕوبارەکانی کوردستان:

کوردستان خاکێکی بەپیت و باشە، سەرچاوەی ئاوی زۆر و روباری هەمیشە ئاوداری هەیە، لەسەرەتاوە لە ئاراکس، یان ئارس سەرچاوەکان دەست پێدەکەن و لە خاکی بنگۆڵەوە کە کەوتۆتە نێوان دیجلە و فورات لە (هەزار دەریاچە) سەرچاوەیان گرتووە.

فورات و دیجلە، کە لە کوردستانەوە هەڵدەقوڵێن دوو روباری گەورەن. فورات لە دوو بەش پێکدێت. بەشی باکووری، لە کوردستاندا ناوی قەرەسووە، ٤٦٠. کیلۆمیترە. درێژایی سەرچاوەکانی لە کێوەکانی دومل و داغەوەیە پاشان لە ئەرزرۆمەوە دێت و لەو ناوچەیە ئاوی روبارەکانی کە سەرچاوەیان کێوی چورەداغە بەو دەگەن و پاشان بە دۆڵێکی تەنگدا بەرەو خۆرئاوا دەکشێت و ئەرزنجان ئاودەدات و بەدۆڵێکی تەسکدا بەرەو خۆرئاوا دەروات و پێنچاوپێچ بەرەو باشوور دەکشێت و ناوچەی کەمارا ئاو دەدات و لە شارۆچکەی کەمالیبە تێدەپەرێ بە تەنیشت کێوەکاندا دەروات کە دۆڵی زۆر سەختیان هەیە.

بەشەکەی تری کە مراد سووی پێدەڵێن، درێژایی ٦١٥ کیلۆمیترە و لە کێوەکانی ئاگرێژان و ئالا داغ و تەندروک لە باکووری دەریاچەی وان سەرچاوە دەگرێت و بەرەو باکووری متمایل و لە دیادین و قاراگوز تێدەپەڕێ جارێکی کە بەرەو باشوور دەگەڕێتەوە توتاق و مەلازگە ئاو دەدات، لەوێوە لە باکووری مووش شارەکانی گەنج و پاڵ و پرتەک ئاو دەدات و پاشان لە باکووری کبان لەگەڵ لقەکەی تری فورات، قەرەسو، یەکدەگرن. پاش یەکگرتنی ئەو دوو ڕووبارە، فورات دروست دەبێت.کە٦٤٧ کیلۆمیتر بە کوردستاندا ئەڕوات. تێکرای درێژی فورات لە نێوخاکی کوردستاندا ١١١٠ کیلۆمیترە و هەموو درێژاییەکەی ٢٨٠٠ کیلۆمیترە. ڕووباری توخمەسوو کە لە باکووری مەلاتییەوە دەچێتە سەر قەرەسوو ١٩٤ کیلۆمیتر درێژە. سەرچاوەی ئەم ڕووبارە لەدەرەوەی خاکی کوردستانە. ڕووباری مرادسوو گەلێ ڕووباری تری دێتەوە سەر لەوانە پەیسوو کە درێژییەکەی ٢٣٥ کیلۆمیترە.

فورات لە کۆندا گەلێ ناوی جۆربەجۆری بووە. سۆمەرییەکان پێیان گوتووە (یورانونو)، واتا ڕووباری گەورە. بابلییەکان پێیان گوتووە (پراتو). فارسەکان بە (ئەفرات) ناویان بردووە. ئەکەدییەکان بە (پوراتی)، یان (پوراتوم) و گریکەکان بە (ئەفراتیس) ناویان بردووە کە بە عەرەبی بۆتە (فورات)، واتا ئاوی پاک.

دیجلە- ڕووبارێکی زۆر گەورەیە. سەرچاوەی لە باکووری کێوەکانی سەعدەنەوە دێت و ٤٥٠ کیلۆمیتر بە باکووری کوردستاندا و بە شارەکانی ئادغانی، دیاربەکر، حەسەن کیف و جزیرەدا تێدەپەڕێت. لەلای چەپییەوە چەند ڕووبارێک: عەنبەر، باتمان، گرزا و بۆتان کە درێژییەکەی ٢٢٤کیلۆمەترە، دەڕژێنە ناویەوە. دیجلە پێش خابوور دێتە سنووری عێراقەوە لەو جێگەیەشدا ڕووباری خابوور دەڕژێتە نێو دیجلەوە، یەکێک

لەلقەکانی خابوور بە ناوی هازیل شاری زاخۆ ئاو دەدات. درێژایی دیجلە لە نێو کوردستانی عێراقدا ۱۵۰ کیلۆمیترە، واتا لە هەموو کوردستاندا ۶۰۰ کیلۆمیترە. تێکرا درێژایی دیجلە ۱۹۰۰ کیلۆمیتر.

دیجلە لە نزیک بەغدا لەگەڵ فورات لێک نزیک دەبنەوە و پاشان لەیەکتری دوور دەکەنەوە، تا لە باشووری عێراق لە شاری قرنە پێکدەگەن و شط العرب پێکدێنن.

سۆمەرییەکان ناوی (ئادیگنایان) لە دیجلە ناوە. ئەکەدییەکان پێیان گوتووە (ئادیگلاتوم)، یان (ئادیگلات). گریکەکان بە (تگریس) ناویان بردووە.

**ئاراز**: ڕووبار یان چۆمی ئاراز لە بنگۆلەوە دێت و ٤٣٥ کیلۆمیتر بە باکووری کوردستاندا تێدەپەڕێت و بە نێوان ئێران و تورکیا و سۆڤیەتدا دەڕوات و، دەڕژێتە دەریای قەزوینەوە. درێژایی ڕووباری ئاراز دەگاتە ۹۲۰ کیلۆمیتر.

**قزل ئوزان**: سەرچاوەی لە باشووری خۆرئاوای شاری (دیواندەرە)ی ڕۆژهەلاتی کوردستانەوە، بە ناوچەکانی زنجان و میانەدا تێدەپەڕێت. پاشان لە باشووری شاری ڕەشتەوە، کە لەوێ بە (سفیدرود) ناوی دەبەن، دەڕژێتە دەریای قەزوینەوە. گاماسیاب، جەختۆ= زێڕین ڕود « ۲٤۰ »کم هەروا ڕووباری « تاتاهۆ » کە هەردوکیان دەڕژێنە دەریاچەی ورمێوە.

**زێی گەورە**: درێژاییەکەی ٤٥۰ کیلۆمیترە سەرچاوەکەی لە باکووری کوردستانەوە و لە کێوی مەرگەنەداغ لە نێوان دەریاچەی وان و ورمێوە سەرچاوە دەگرێت. جۆلاً مەرگە ئاو ئەدات و دێتە باشووری کوردستانەوە ناوچەی زێبار و بارزان ئاو دەدات. یەکێک لە لقەکانی لە ڕووباری ڕەواندزەوە دێت و لە باشووری شاری موسڵەوە دەچێتە سەر دیجلە.

زێی بچووک: ٤٠٠ کیلۆمیتر درێژە لە ناوچەی لاجانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە دێت و، لە رۆژهەلاتی کوردستانەوە تا باشووری، گەلێ رووبار تێکەڵی ئەم زێیە دەبن، کە بە تەقتەق و ئاڵتوون کۆپریدا رەت دەبێت و دەچێتە سەر دیجلە. لە ساڵی ١٩٥٨دا لە ناوچەی دوکان بەربەستێک لەسەر ئەو ئاوە کراوە کە (٧) بلیۆن میتری شەشگۆشەیی ئاو دەگرێت و مەودای ٥٠ کیلۆمیتر چوارگۆشەیی داگرتووە. ئەم زێیە پێشتر ناوی کیالوی بووە و دوایی بۆتە لاوین.

رووباری عوزێم، ٢٣٠ کم درێژە و سەرچاوەی لە بازیانەوە دێت، داقوق و توزخورماتو ئاودەدات و دەچێتە نێو دیجلە.

سیروان: لەپێش زایینیدا بە (ئەترکون) و (تورمەر) یان (تامارا) ناویان بردووە. درێژایی رووباری سیروان ٣٨٦ کیلۆمیترە، کە لە کێوەکانی رۆژهەلاتی کوردستانەوە دێت. لە نێو باشووری کوردستاندا رووباری تانجەرۆ، کە دەشتی شارەزوور ئاو دەدات. دەرژێتە نێویەوە. لە دەربەندیخان بەربەستێکی گەورەی لەسەر دروست کراوە. ئەو رووبارەیش دەرژێتە ئاوی دیجلەوە.

## • دەریاچەکانی کوردستان:

دەریاچەی وان: گەورەترین دەریاچەی کوردستانە. رووبەرەکەی ٣٧٦٥ کیلۆمیتر چوارگۆشەیە. قولاییەکەی ١٠٠ میترە و بەرزییەکەی لە رووی دەریا ١١٢٠ میترە. ئەو کێوە ئاگر پژێنانەی لە چواردەورەی ئەم دەریاچەیەدان. کە سودە و سولفات و... هتد لەوانەوە دەرژێتە دەریاچەکەوە ئاوەکەی سوێر کردووە. لەو دەریاچەیەدا تەنیا یەک جۆرە ماسی راو دەکرێت کە پێیدەڵێن (بلیک).

لە باکووری دەریاچەی وانەوە دەریاچەی (نازلیک) هەیە، لە

باکووری رۆژهەلاتی ئەم دەریاچەیەدا دەریاچەی (ئارچک) هەیە. لە باکووری رۆژئاوای مەعدەن، لەو جێگەیەی کە سەرچاوەی دیجلەیە، هەزار قولو هەیە کە زۆر قووڵە و رووبەرەکەی دەگاتە ٠.٥ کیلۆمیتری چوارگۆشەیی. ئاوی ئەمیش سوێرە و مارماسی تێدا راو دەکرێت.

دەریاچەی ورمێ: پێشتر پێیان گوتووە (چی چیت)، ئیسرابون پێی گوتووە (ماتیینی). ئەم دەریاچەیە لە خۆرهەلاتی شاری ورمێ هەڵکەوتووە، رووبەرەکەی زیاتر لە ٦٠٠٠ کیلۆمیتری چوارگۆشەییە. درێژاییەکەی نزیکەی ١٣٠ کیلۆمیتر و پانییەکەی ٥٠ کیلۆمیترە. قولاییەکەی لە نێوان ٦ تا ١٥ میترە. ئەو دەریاچەیەش ئاوەکەی سوێرە و هیچ جۆرە ماسییەکی تێدا ناژی. لە نزیک ئەو دەریاچەیەوە دوو دەریاچەی بچووک هەن بە ناوی (شورگول) و (قوپییە).

دەریاچەی زرێبار: پێشتر بە (میهریان) ناویان بردووە. ئەم دەریاچەیە لە نزیکی سنووری کوردستانی عێراق و، لە خۆرئاوای مەریوان و باشووری رۆژهەلاتی پێنجوێنە. درێژاییەکەی ٤.٥ و پانییەکەی ١.٧ کیلۆمیترە و قولاییەکەی ١٥ میترە.

لە باکووری کوردستاندا دەریاچە نییە. کوردستان بەهۆی بەرزییەوە ئاووهەوای کێوەکانی زۆر ساردە لە هەندێ لوتکەی کێوەکانیدا بەساڵ بەفری پێوە ئەمێنێت، باران وەک یەک نییە لە هەندێ جێگا ساڵانە لە نێوان ٢٠٠ - ٤٠٠ میلیمەتر ئەبێت وە ئەو دەشتانەی کە کەوتونەتە نێوان کێوەکانەوە بارانی ٧٠٠ یان ٢٠٠٠ وە هەتا ئەگاتە ٣٠٠٠ میلیمیەتر وە هەندێ جێگاش کەم بارانە. پلەی سەرما دیسان لە کوردستاندا جۆراو جۆرە، بە پێی دەشتاییەکان و دوور لە کێوەکان وە نزیکە کێوەکان ئەیگۆرێت و وەک یەک نین. لە قاراگۆزە کە کەوتۆتە بەشی باکور لە زستاندا پلەی سەرما ئەگاتە ٣٠-٣٥ پلەی سانتیگرات.

کرماشان کە کەوتۆتە بەشی باشوری کوردستان لە هاویندا پلەی گەرما ئەگاتە ۳۰ - ٤٠ پلەی ژور سفر وە لە زستـاندا لە مانگی کانونی دووەمدا سەرما ئەگاتە ۱۰-۱۵ وە باران بە تێکڕایی بەساڵ ئەگاتە ٤٨٩ ملیمەتر. لە سەنەندژ ـ سنە گەرما لە مانگی تەموزدا ئەگاتە ۳۵ سانتیگرات وە لە مانگی کانونی دووەمدا سەرما ئەگاتە ۱۵ پلەی سانتیگرات، باران ٥٠٠ ملیمەتر لە ساڵێکدا، کەرکوک لە تەموزدا پلەی گەرما ئەگاتە ٤٣ ژور سفرەوە سەرما لە مانگی کانونی دووەمدا ئەگاتە ١٤,٥. خانەقین لە مانگی تەموزدا گەرما ئەگاتە ٤١,٨ وە سەرما لە مانگی کانونی دووەمدا ئەگاتە ۲ باران ۳۸٥,۲ ملیمەتر لە ساڵێکدا.

مەلاتیە گەرما ۲٦,٥ سەرما ١,٥ باران لە ساڵێکدا ٤٤٠ ملیمەتر
وان گەرما ۲۲,٥ سەرما ۳,٥ باران لە ساڵێکدا ۳۸٠ =
ئورفە گەرما ۳۲ سەرما ٤,٥ باران لە ساڵێکدا ٤٤٠ =
دیاربەکر گەرما ۳۱ سەرما ۲,٥ باران لە ساڵێکدا ٤۷٠ =

**دارستان:**

دارستان لە کوردستاندا زۆرە بەتایبەتی لە شاخەکاندا.

- ئێران چوار میلیۆن هەکتار دارستانە زۆری داری بەڕوون
- کوردستانی تورکیا ٦٪ لە هەموو زەویدا.
- کوردستانی ئێران ٣٢٪
- کوردستانی عێراق ٨٪

بە تێکڕایی هەموو کوردستاندا دارستان، ٦ میلیۆن هەکتارە کەواتە لە

١٤٪ ڕووبەری کوردستان.

ڕووبەری دارستان بە هەزارەها هەکتار:

| عیراق | ئێران | تورکیا | سوریا | کوردستان |
|---|---|---|---|---|
| ١٥٤٠ | ١٩٠٠٠ | ١٠٥٤٨ | ٤٤٩ | ٥٧٤٠ |
| ڕێژەی دارستان بۆ ڕووبەری هەموو | | | | |
| ٪٣،٥ | ٪١١،٦ | ٪١٣،٨ | ٪٢،٤ | ٪١٤،٩ |

١٥ جۆر داری بەڕوو لەناو ئەو دارستانەدا هەیە.

کشتوکاڵ لە کوردستانی تورکیا لە ٢٥ ملیۆن هەکتار زەوی ٪٣٠ بەکار دەهێندرێت، کە لەو بەشە هەموو ساڵێک ١،٣ بێ بەرهەم ئەمێنێتەوە. لە کوردستانی ئێران لە ٥ ملیۆن هەکتار زەوی کە بۆ کشتوکاڵ ئەشێت لە ٪٢٤ بەکار دەهێندرێت کەلە ٪١٦ هەموو ساڵێک دەمێنێتەوە.کوردستانی عیراق ٨ ملیۆن هەکتار زەوی بۆ کشتوکاڵ ١،٤ ی تەنها بەکار ئەهێنرێت. وەک گەنم و جۆ و نۆک و نیسک...

بەم جۆرەی خوارەوە لە تورکیا لە ٪١٥ لە ئێران ٪٢٥ لە عیراق ٪٥ کە لە ٪١٥ بە جۆ ئەکرێت، جگە لەوە پەمۆ، چەوەندەری شەکر، هەروەها باشترین توتن کە لە کوردستانی تورکیا و کوردستانی عیراقدا ئەکرێت، توتنی کوردستانی عیراق بەشی هەموو عیراق ئەکات.

درەختی مێو لە کوردستانی تورکیا و کوردستانی عیراق و کوردستانی ئێران ئەکرێت و ٣٤ جۆر ترێ هەیە، جگە لەوانە هەنار، هەڵوژە، سێو، هەنجیر، هەڵوژەی زەرد، گوێز، هەرمێ، قەیسی، بەهێ،

گیلاس، قوخ لە هەموو کوردستانەکاندا پیاز، شوتی، خەیار، ترۆزی، کاڵەک، تەماتە، باینجان، زەرات، بیبەر، کاهو.
کیانلەبەری کەژی لە کوردستانەکاندا لەناو نەچوون، لە سەرەتای سەدەی ١٩دا لە کوردستاندا « شێر » هەبووە هەرچەند ئێستا نەماوە. پڵنگ هەیە، بەوری بەیان لە باشووری وان هەیە، ورچ، بەراز، گورگ، مەیمون، رێوی، چەقەڵ، کەمتیار، کەڵەکێوی، ئاسک، کەروێشک، سوچەر،چاڵەکە، دەڵەک، بونکە، سەگ گلاو. مریشک، قەل، قالومراوی ماڵی کراو، هەروەها باڵندەی زۆریش هەیە کەو، سوێسکە، کۆتر، پۆڕ، قازو مراوی باڵندەی کەی ناوی لە دەریاچەکان و رووبارەکاندا هەیە. جگە لەوانە ماسی لە دەریاچەکان و رووبارەکاندا هەروەها ماری زۆر سامناک و ژەهراوی و کوشندە، دوپشکی رەش و زەرد.ماڵباتی ماڵی کراو .گا و مانگا و گامێش، مەڕ و بزن، ماین و هێستر و گوێدرێژ هتد.

## سامانی سروشتی کانزایی کوردستان

نەوتی کوردستان لە عێراقدا لە ناوچەکانی کەرکوک و زمار و خانەقین دەرئەهێنرێت.لە تورکیا لە سێرتو باتمان دەرئەهێنرێت. لە ئێران لە کرماشان دەرئەهێنرێت. لە سوریا لە قەرچوک دەرئەهێنرێت.نەوتی ئێران و عێراق و تورکیا زۆربەی زۆری هەمووی لە خاکی کوردستاندایە. بێجگە لە نەوت، ئاسن، توتیا، قورقوشم، زیو، کرۆم و مولبیدن هەیە. مس لە ناوچەی ئەرگانە « دێرسیم » دەرئەهێنرێت. لە پالو، ئاکری و ناوچەکانی دەوروبەری وان مسی خاو دەست ئەکەوێت لە کوردستانی ئێران لە سنە کبریت، وە لە باشووری کرماشان زێڕ، وە زیو لە کابان و خەڵوزی بەرد و خوێ زۆرە.خەڵوزی بەرد لە زۆربەی شوێنی بەشەکانی کوردستاندا هەیە و بە شێوەیەکی تایبەتی لە سایقانە، تارپێت، وان، کیماه، جیمش، خزکو،

زاخۆ دا هەیە، ئاسن لە ناوچەکانی مادەن، ئامێدی، هەیە.قورقوشمی خاو لە کیانە، کروم و مەگنیسیۆم لە بارزان، زێر و زیو لە ناوچەی دیاربەکر هەیە، هەروەها گۆگرد لە ناوچەی ئەردیش، جۆلەمێرگ و باشقەلا، نەوتی کوردستان بەشێکی زۆری ئەو نەوتە پێک دێنێت کە لە رۆژهەلاتی ناوەراست دەرئەهێنرێت، چاڵە نەوتەکانی کەرکوک لە ناوچەی باباگورگور دایە لە کەرکوک لە سالی ۱۹۷۰دا ۸۳ ملیۆن تەن نەوت دەرهێنراوە. بەپێی رادەی دەرهێنانی نەوت لە سالی ۱۹۵۵ دا کوردستان پێنجەمین ولاتانی جیهان بوو لە رووی دەرهێنانی نەوتەوە لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا تێکرا بەرووبوومی کشتوکالی و ئاژەلی بە رادەیەکی بەرفراوان سەرچاوەیەکی گرنگی سامانی کوردستان پێک دێنن.

لە سالی ۱۹۵۷دا لە ناوچەی کوردنشینەکانی تورکیا ۷,٦٦٢,٣٣٣ سەرمەر هەبووە، وە، ٤,١٧٦,٠١٦ سەر بزن ئەمەش کە ١,٤ ی هەموو مەرو بزنی تورکیا ئەگرێتەوە، وە ٢,٢٤٠,٨٢٥ سەر گا و مانگا هەبووە.لە ناوچەی کوردستانی عێراق ١,٦٧٤,٩١٢ سەر مەر هەبووە کە لە سێ بەش دوو بەشی هەموو مەری عێراقە، ٢,٢٣٤,٢٣٨ سەر بزن وە ٢٢٦,٨٥٨ گا لە سێ بەشی هەموو گا لە عێراقدا، وە ٤,٢٧٨ سەر گامێش لە دە بەشی بەشێکن. کوردستانی عێراق لە دیهاتی کوردستانەکانی کە ژیانی باشتر بووە، هەروەها هێستر و ماین و مالیاتی کە، لە کوردستانی عێراقدا ٢٢,٢٨٩ سەر ئەسپ و ماین هەبووە، وە ٥٢,٣٣٦ هێستر وە ٠٤٠٠١٣ سەر گوێدرێژ هەبووە ئەمەش بەرامبەر بە سێبەش بەشێک. هەروەها بالندەی مالی کراو و قاز، مراوی و قەل، مریشک...

«٢»

# مێژووی کۆنی کورد

ووتمان کۆنترین جێگایەک کە ئادەمیزاد، کۆمەڵگای لێ دروست بوو بێت بەرەو شارستانیەت هەنگاوی نابێت خوزستان و نێوان دوو رووبار وادی نیل بەپێی بەراورد کردنی پاشماوەی کۆن کە دۆزراوەتەوە لە نووسینەکانی کلدانی و ئاشوریدا باسی ئەم جێگایانە کراوە، ناوچەیەکی فراوانی شاخاوی کە بە زاگرۆس ناوبراوە، کە ئەمڕۆش لەبەشی خۆرئاوای ئێران و رۆژهەڵاتی تورکیا وە باکوری عێراقدایە، وە ناوی کشتوکاڵی ئەم جێگایانەی لەسەرەوە ناومان بردن لە کێوەکانی جێنشین ئەمانەوە هاتۆتە خوارەوە واتە کوردستان، کورد لە چەرخی کۆندا بە چەند ناوێکی جیاواز نووسراوە، ناوەکان لە یەکەوە نزیکن، کوردۆ بە زمانی ئەکەدی و ئاشوری بە واتە بە توانا وە پاڵەوان وە کاردۆ واتە بەهێزبوون. کورد لە:

لای سۆمەریەکان بە گۆتی، جوتیو جودی

لای ئاشوریەکان بە کورتی و کاردۆ

لای نارامیەکان    بە گوتی، کارتی، گورتی، گورتی، کاردۆ، کارداکا، کارکتان، کارداک

لای گەلانی ئێران بە سیرتی، کۆرتیوی، کوردیوی، کوردارها.

لای گریک و ڕومان بە کاردۆسیٚ، کاردخویٚ، کاردۆک، کوردۆکیٚ، کوردۆخویٚ، کوردۆتی، کوردین، کاردۆتی، کوردۆنسو کوردیای، کاردۆیکای، کاردوای،

مێژووناسەکان بە کوردونیک، کورخیچ، کوریتێخ، کرخی، کۆرخی، کوردواتسی، کورتنغ، کرتوەل، گردیایوی.

مێژوو ناسانی عارەب بە کوردی، کاردۆی، باقاردا، کارتاویا، جوردی، وەجودی، ناسیوە.

گەزەنغون لە کشانەوەی دەهەزار کەسەکەیدا بەرەو یۆنان لە کتێبەکەیدا بە ناوی کرۆپیدیا کورد بە کاردۆخین ناو ئەبات.کورد وەک فارس، ئەفغان، تاجیک، تالسن، زمانی تایبەتی خۆی هەیە، ژیانی ئابووری سەربەخۆ، فەرهەنگ و مێژووی تایبەتی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە بە هیچ جۆرێک گەلی کورد بە گەلی فارس یان ئێران دا بنرێت، ئەبێت پروپاگەندەی پان ئێرانیستەکان ڕەت بکرێتەوە چونکە لە ڕاستیدا گەلی ئێران نیە بەڵکو کۆمەڵێک گەل و نەتەوەیی لە ئێراندا هەن، لە تورکیا دان بە بوونی کورد نانرێت و پێیان دەڵێن تورکی شاخ، لە عێراقدا پێیان دەڵێن دانیشتوانی باکور وە لە سوریا پێیان دەڵێن جزیرەی.

## زمان، ئەدەب، نووسین

زمانی کوردی لە بنەماڵەی زمانی ئاریبە، وەکو زانراوە پێک هاتووە لە زمانی ئێرانی و ئەفغانی و بلوچی و ئەسیتین و گەلیٚ شێوەی زمانی کۆن و تازەی تریش، زمانی کوردی فارسی نیبە و کرابێت بە کوردی،

ملکو زمانێکی سەربەخۆیە و یاسای فۆنێتیک و سینەکسیسی تایبەتی خۆی هەیە، پەیوەندیشی بە زمانی فارسییەوە وەکو پەیوەندی سربی بە ڕووسییەوە وایە، یان بە شێوەیەکی وردتر، وەکو زمانی ئاری سویسری بە ئاخاریەکان بە زمانی ئیتالیەوە وایە. زمانی کوردی بەستراوە بە زمانی « ئاوێستا » وە کە کتێبی پیرۆزی « ئاوێستا » کتێبی ئاگرپەرستەکانی پێ نووسراوە، بیروڕایەکیش هەیە زمانی کوردی وەکو بەشی زۆری شێوە زمانە تازەکانی تری ئێران، بەشی زۆری دروست بوونی کۆڵەکەکانی لە زمانی میدی کۆنەوە وەرگرتووە.

ئەدەبی میللی ناو کوردەکان زۆر دەوڵەمەندە گەلێ سەرگوزشتەی خووڕەوشتی نەتەوایەتی و گەلێ گۆرانی و پاڵەوانێتی تیایە، بە تایبەتی پاڵەوانیەتی بەرگری کردن لە قەلای دمدم کە ئەکەوێتە خوارووی ورمێ لە نزیک ڕووباری براندوزەوە، هەروەها « مەم و زین » ئەمەش لە شێوەی شیعر و پەخشانی لاواندنەوە دایە.

یەکەم ڕۆژنامەی کوردی پێی ئەوترا « کوردستان » لە ساڵی ۱۸۹۸ ز لە قاهیرە دەرچووە، دوای ئەوە گوێزراوەتەوە بۆ جنێڤ، عبدالرحمن بەگ کە یەکێک بووە لە کورەکانی بەدرخان دەریکردووە، دوای ئەو ڕۆژنامەی دووەم دوای شۆرشی تورکی دامەزراوە « مەشروتە » شێخ عبدالقادر دایمەزراندووە، پاشان کۆمەڵێک لە کوردەکان لە ساڵی ۱۹۱۳دا لەناو جەماوەری قوتابیان و ڕۆژنامەنووساندا کۆمەڵەی « هێڤیا کوردی »یان دامەزراندووە دەستیان کردووە بە بلاوکردنەوەی گۆڤاری « ڕۆژی کورد »ی، هەروەها پرۆژەیەکی ئەلف و بێی تازەی بۆ زمانی کوردی داناوە. وە لەساڵی ۱۹۱٤ناوی گۆڤارەکەیان گۆڕیوە بە « هەتاوی کورد ».

کوردستان وڵاتێکی شاخاوییە، بە سەرچاوەی « کان » دەوڵەمەندە، شیو و دۆڵی سەوزە، دەشتاییەکانی بۆ کشتوکاڵ بە پیت و بەرەکەتن،

چیاکانی لە کۆندا لیڕەواری چڕ بوون، بەڵام ئیستا چەند لیڕەوارێکی کەمی ماوە.

## ئایین و باوەڕی کوردان:

پێش ئیسلام دیانەتی زەردەشت بوو، پێش ئەوەش خۆرپەرست، مانگ، ئەستێرەکان، ئاگر. ئیستا دینی ئیسلام بەشی زۆری کوردەکانە هەروەها مەزهەبی سوونی بەشی زۆری کوردەکانە، وەبەشێکی کەم کورد شیعەن لە باشووری کوردستاندا لە کرماشان و لورستان. جگە لەمانە، یەزیدی، صارلی، شەبەک، بجوران، وە ئەهلی هەق، علی بە خوا ئەزانن« علي اللهي »یە. مسعودی لە مروج الذهب بەرگی ٣ لە ناو تیرەکانی کوردا کۆمەڵێک لە نەسرانی وە یەعقوبی و جورقانی ناو بردووە کە لە موصل و دەورووبەری شاخی جودی دانیشتوو بوون.

## مێژووی سەردەرهێنانی پەیوەندی فیوٚدالی لە کوردستاندا:

هەروەک مێژووی سەردەرهێنانی فیودالیزمی وڵاتی ترە، ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بناغەی سیستەمی کۆیلەداری و سێرفداریدا دامەزرا بوون رووخان و تیا چوون کە ئەمەش کوردستان ئەگرێتەوە، لە سەرێکی ترەوە ڕووخانی سیستەمی خێڵەکی « پاتریارکی » خێڵە دڕندەکانی چیا. دراوسێکان دەستیان پێکرد لە ئەنجامی ئەم دوو پرۆسەیە لەسەر وێرانگای هەردوو سیستەمدا فیۆدالیزمی کۆچەرانە پەیدا بوو لە سەقام گیرکردنی سیستەمی فیۆدالیزم لە کوردستاندا خێڵ ئەخشێکی گرنگی هەبووە.پشت بەستن بە بەڵگە مێژوویەکان لە کوردستاندا سیستەمی کۆیلەداری لە

نارامدانە بووە، مارکس لە تێزەکانیدا دەربارەی « خورما سیوونەکان » پێش سەرمایەداری ڕوونی کردۆتەوە کە لە ڕۆژهەڵاتدا سیستەمی کۆیلەداری لە گۆڕێدا نەبووە، چونکە شێوەی ئاسیایی بەرهەم هێنان کە لە ڕۆژهەلاتدا باو بووە دەرەفتی پەیدا بوونی ئەو چەشنە سیستەمەیەی نەداوە. بەپێی نووسینەکانی مارکس و ئینگلس دەربارەی شێوەی ئاسیایی بەرهەم هێنان، کوردستان بەبێ ئەوەی بە قۆناغی سیستەمی کۆیلەداریدا تێپەڕێ، لە کۆمۆنی سەرەتاییەوە ڕووی کردە چەشنێکی دیاریکراوی فیوداڵیزم، کە پێی دەووترێت فیودالیزمی کۆچەرانە، لە ماوەی یەکەم پێنج سەدەی کۆچیدا سیستەمی فیودالیزم لە کوردستاندا سەری دەرهێنا و ڕەگی داکوتا. پاشان چەند بنەماڵەیەکی پاشایەتی کورد پەیدا بوون سیستەمی پاریاکی لە کوردستاندا هەرەسی هێنا. لێرەدا نامانەوێت درێژە بەم بەشە بدەین تەنها مەبەستمان ئەوە بوو کوردستان بە سیستەمی کۆیلەداریدا تێ نەپەڕیوە.

## جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان ئەکرێتە سێ قۆناغ

١- جوڵانەوەی یەکەم لە سەرەتای سەدەی ١٩ وە دەست پێدەکات گرنگترین کەم و کوڕی ڕاپەڕینەکانی ئەو قۆناغە ئەوەبوو کە حزبێکی سیاسی یان سەرکردایەتیەکی بە کۆمەڵ ڕابەرایەتی ئەو جوڵانەوەی نەکردووە، بەڵکو ئەوەی ڕابەرایەتی ئەو جوڵانەوانەی ئەکرد، ڕابەرو پێشەوا ناودارەکانی کۆمەڵی کوردەواری بوون، بەشێک لەوانە خۆیان ئەمیری ناوچەکان بوون و بەشێوەیەکی توندیش ناکۆکی لە نێوان ئەو ئەمارەتانەدا بووە بە شەڕ و شۆڕ و داگیر کردن دژی یەکتر، وەک ئەمارەتی بان،

ئەمارەتی سۆران، ئەمارەتی ئەردەلأن... هتد. بۆیە دوژمنەکانی گەلی کوردیش بە باشی سودیان لەو ناکۆکیانە وەرگرتووە. وەک عوسمانییەکان و صەفەوی و قاجارانەکانی فەرمانڕەوای ئێران. تێکڕای ڕاپەڕینەکان روخساری نەتەوایەتی نیشان ئەدەن، ئەمەش ئمونەی جولانەوەکانی ئەو قۆناخەیە:

١- جولانەوەی عبدالرحمن پاشای بابان لە سلێمانی سالی ١٨٠٨-١٨٠٦.

٢- جولانەوەی ئەحمەد پاشای بابان سالی ١٨١٢.

٣- ڕاپەڕینی کوردەکانی زازا لە سیواس سالی ١٨٢٠.

٤- جولانەوەی میر بەدرخانی لە جزیرە ١٨٢١-١٨٤٧

٥- جولانەوەی محمد پاشا لە ڕەواندوز ١٨٢٦-١٨٣٣

٦- ڕاپەڕینی کوردەکانی شەنگار ١٨٣٠-١٨٣٣

٧- جولانەوەی میر شەریفخانی بەتلیس ١٨٣٤.

٨- جولانەوەی عزەدین شێر ١٨٥٣.

٩- جولانەوەی حسێن کنعان پاشا و عوسمان پاشا ١٨٧٩.

١٠- جولانەوەی شێخ عبیداللەی شەمزینی ١٨٨٠-١٨٨١، ئەمە زۆر گرنگ بوە و دروشمیان رزگار بوونی کوردستانی ئێران و تورکیا بووە، واتە هەموو کوردستان.

١١- ڕاپەڕینی کوردەکانی موصل و ئەرزروم و بەتلیس ١٩٠٧.

١٢- جولانەوەی مەلا سەلیم و شەهابەدین لە بەتلیس ١٩١٣.

## قۆناغی دووەم:

لە جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا جەنگی دووەم، جولانەوەی ئەو قۆناغە ڕێکوپێکترن و حزبی سیاسی و خاوەن بەرنامەی روون و دیاریکراو و

سەرکردایەتی خەبات نەکات، بەلاّم سەرزکایەتی شۆڕش هێشتا بە تەواوەتی لە دەست چەند رابەرێک دەرنەچووە.
١- جولانەوەکانی شێخ محمود لە سلێمانی لە سالانی ١٩١٩-١٩٣٢.
٢- جولانەوەی سمکۆ لە کوردستانی ئێران سالی ١٩٢٠-١٩٣٠.
٣- جولانەوەی شێخ سەعید بە سەرکردایەتی حزبی تەعالی کوردستان لە کوردستانی تورکیا ١٩٢٥.
٤- جولانەوەی ئاگریداغ ١٩٢٦-١٩٣٠.
٥- جولانەوەی شێخ ئەحمەدی بارزانی ١٩٣١-١٩٣٤
٦- جولانەوەی جافر سولتان لە کوردستانی ئێران ١٩٣١-١٩٣٢.
٧- راپەڕینی کوردەکانی دیاربەکر١٩٣٤.
٨- راپەڕینی کوردەکانی دێرسیم ١٩٣٧.

## قۆناخی سێیەم:

لە جەنگی جیهانی دووەمەوە تا ئەمڕۆ ئەم قۆناغە زۆر رێکوپێکتر بوو، حزبی سیاسی دروشمی روون و ئاشکرا، رەنگی دیموکراتییەتی نەتەوەیی لە خۆی ئەدا.
١- جولانەوەی ١٩٤٣-١٩٤٥ کوردستانی عێراق بە سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی و حزبی رزگاری کورد کە پاشان لەگەڵ جولانەوەی دیموکراتی ئێراندا ئاوێتە بوو.
٢- جولانەوەی دیموکراتی ١٩٤٥-١٩٤٦ کوردستانی ئێران بە رابەرایەتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پێکەوە نانی کۆماری مهاباد.
٣- راپەڕینی کوردەکانی جوانڕۆ لە کوردستانی ئێران سالی ١٩٥٦.
٤- شۆرشی ئەیلولی سالی ١٩٦١ لە کوردستانی عێراق بەرابەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق.

٥- راپەڕینی نوێی کوردستانی عێراق بە رابەرایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستانساڵی ١٩٧٦.

٦- جولانەوەی گوڵان پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ١٩٧٦.

٧- جولانەوەی کوردەکانی ئێران بە رابەرایەتی مەلا ئاوارە و هەندێکیکە ١٩٦٦.

٨- شۆرشی کوردستانی ئێران بەرابەرایەتی حزبی دیموکراتی ئێران ساڵی ١٩٧٩.

٩- جولانەوەی هێزە نیشتمانیەکانی کوردستانی تورکیا پاشان بەرەیەکیان پێکهێنا بە ناوی تەڤگەر لە ساڵەکانی حەفتادا.

« ٣ »

# راگـــوێـــزان

کوردی کوردستان دەست درێژی بۆ هیچ لایەک نەکردووە تەنها داوای ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیی کردووە لە دەست درێژی و ئەو ولاتانەی کە داگیرکەر بوون. هەر لەبەر ئەوەش بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە پەلامار ئەدران و بە هەموو شێوەیەک هەوڵی لەناوبردنیان ئەدا بەکوشتن،ئازارو ئەشکەنجە،بێدەرامەتی، لێبڕینی خۆراک، بەعەرەبکردن، بەفارس کردن، بەتورک کردن. دێهات و شار سووتاندن، ناو گۆڕینی شار و گەڕەک و جێگاکان، لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا زۆر جێگا ئازادی سەربەخۆییان وەرگرت و بوونە وڵات، کورد لە کوردستاندا تەنها بە هەندێک داوای کەمیش رازی بووبن، بەلام بە ئاگر و ئاسن وەلام دراونەتەوە... بۆ نموونە.

## کۆچکردنی کوردەکان بۆ خوراسان:

لە دەورانی سەفەوییەکانی فەرمانڕەوای شا ئیسماعیل و شا تەهماسب و شا عەباس بۆ خوراسان کۆچ کراون کۆچی گەورەی کورد بۆ خوراسان لە ساڵی ٧. . ١ی مانگی لە ناوچەی خوارەوەی رامین بەرەو خوراسان دەستی

پێکرد، شا عەباس کوردی بۆ رۆژهەڵاتی تاران هێناو بوو تا بەرهەڵستی بکەن لە هێرشی ئوزبەگەکان. ئەم کۆچ پێکردنە لە ساڵی ۷..۱-
.۱.۱یٌ مانگی درێژەی کێشا. کوردەکان لە ناوچەکانی سنووری بە تایبەتی لە « درون » یان « درونگر » باخود « دەرگەزی ئێستا » شوێنی خۆیان دامەزراند، دوای ئەوە کوردەکان یەکم شاری خۆیان بە ناوی « شیروان » دامەزراند و لە کەناری شارۆچکەی خەبوشان پێگەی شەری خۆیان دروست کرد کە بە گەرەکی کوردان ناسراو بوو، وە ئێستا بە « قوچان » ناوبانگی دەرکردووە، لە کۆتای فەرمانڕەوای سەفەویەکاندا دۆڵی خانی کوردی شادلو، شاری « بجنورد »ی دروست کرد کە ئێستا شارێکی گرنگی خوراسانە، لە نێوان ئاوایبە ناوەندەکانی کوردەکانی میلانلو کە ئێستا بە « ئەسفەراین » ناسراوە، تاوەکو ئێستاش کوردی تێدا دەژی.

وە لە کۆتای دەورانی قاجاریدا شاری سەر سنوور « باژگیران یان باجگیران »یان دروست کردو، « چناران »یش بووە مەڵبەندی فەرماندەری کوردەکانی « زەعفەرانلو » کە ئێستا شارێکی خنجیلانەی سەر بە پارێزگای مەشهەدە، هەروەها شاری دەرگەزیان دروست کرد، ئەم کۆچ کردنەش لە کوردەکانی کوردستانی ئێرانەوە بۆ خوراسان بوو بە ناوی « ایل چمشگزک » بە گوێرەی بەڵگە مێژوویەکام نزیکەی ٤٥ هەزار خێزانی کورد بەرەو خوراسان کۆچ کراون کە ئەکاتە ....,۲۲٥ کەس.

وەلە فەرمانڕەوایی نادر شادا دوویارە نزیکەی دوو هەزار خێزانی کوردی عومەرانلو بۆ ناوچەی « گیلان » گواستەوە، تابێنە بەربەستێک بۆ هاتنی رووسەکان، نزیکەی ٦۰ گوندی کورد نشین، هەمووشیان بە زمانی کوردی شێوەی کرمانجی سەروو، قسە ئەکەن و گۆرانکاریان بەسەردا نەهاتووە، هەروەها نادر شا، ..٤,٥ ماڵی کوردی لە ئەفشار

ناوچەیئازربایجانی ئورمیێوە گواستەوە بۆ خوراسان وەلە ناوچەی ئابیوەرد و دەرەجز جیٚ نشینی کردن، پاش ئەوەی کە ناوچەی ئەرزروم و بەلباس کەوتە ژێر دەستی لەوانەش ۳ هەزار ماڵی لەو تایفانە کۆچ کرد بەرەو خوراسان و لە ناوچەی خەبوشان ئالی ئالاداغ جیٚ نشین کردن. لە خوراسان یەک میلیۆن کورد هەیە وە ۱,٦۰۰ گوندی کورد نشین هەیە و لە شارەکانی بجنورد، جاجرم، سەبزەوار، نەیشاپور، شیروان، قوچان، مەشهەد، دەرگەز، لەوانەش ٥ هەزار خێزان تاوەکو ئێستا هەر بە شێوەي کۆچەری و چادر نشین ئەژین، ئەمڕۆ گەورەترین مەڵبەندی کۆبوونەوەی کورد لە خوراسان شاری مەشهەدە.

زۆر لە مێژوو نووسان ئەڵێن کورد لە خوراساندا لە هاتنی عارەبەوە بۆ سەر ئێران دەست پێدەکات واتە لە دەورووبەری ساڵی ۳۰ک دا. هەرچەند کۆچکردنی زۆر و فروان لە فەرمانڕەوای شاعەباسدا بووە ئەمە راستە... بۆ روون کردنەوەی ئەوەش وا هەندیٚ ڕووداوی مێژوویی ئەخەینە ڕوو پێش ئەو مێژووەی شا عەباس ـ نووسەر ـ

لە شەرفنامەی شەرفخانی بەدلیسی ـ هەژار کردوویە بە کوردی ـ لە لاپەرە ۲۲۳ هەژار نووسیویەتی:

عەباسییەکان بە هۆی کۆمەڵیٚ نهێنی و لە سایەی ئازایەتی ئەبوو موسلیمی خوراسانی، بوونە پادشای هەموو ولاتی ئیسلام، پایتەختیان کوفە و پاشان بەغدا بوو، یەکەمیان عبداللە کوردی محمد: عەبباسی سەفاحە.ساڵی ۱۳۲ک ۷٥۰ز هاتە سەر حوکم و ٦٥٦ک ۱۲٥۸ز بە کوژرانی معتصم دوا براوا بوون واتا ٥٤٤ ساڵ خەلیفایەتیان کردووە. ئەبو موسلیمی خوراسانی کورد بووە، ئەبو جەعفەری منصور خەلیفەی عەباسی لە دیوەخانی خۆیدا کوشتویەتی. ئەبو دولامەی شاعیری خەلیفە بە مردنی خۆش بووە و دەڵیٚ:

ابـا مجـرم مـا غـيرالله نـعمـه ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ على عبده حتى يغيرها العبد
امني دوله المنصور حاولت غدره ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ الا ان اهل الغدر ابائک الكرد

کوردبیەکەی ئەمەیە: باوکی گوناهکار خوا لە بەندە ناگۆڕێ تا بەندە لە خۆی نەگۆڕێ، تۆ لای مەنسـور بوو بووی و تەمای غەدرت هەبوو؟ بەڵێ دەزانین باوکە کوردەکانیشت هەر ئەهلی غەدر بوون! ئەوە نموونەیەکە پێش هاتنی عەباسیـەکان لە خوراساندا کورد هەبووە..

لە اترکنامە تاریخ قوچان، دانەری رەمضانعلی شاکری ل: ٢٨.

کلاویخو اسپانی لەسەفەر نامەکەی خۆیدا وای نووسیوە:

ئەمرۆ پێنج شەممەی یەکەمی ژانویە سالی ١٤٠٥ زاینی بەرامبەر بە سالی ٨٠٨ک گەشتە شارێک لە پێ دەشت و پشتی شاخ، ئەم شارە ناوی خەبوشان بوو، دیواری شاری نەبوو، ئەم پێنج شەممە و هەینییە لێرە مامەوە. خەبوشان یەکەم شاری ئوستانی ماد بووە. دانیشتوانی قوچان کورد و تاجیکن، تێکڕا هەموو شیعە مەزهەبن. دیـان ئەم مێژووە لەگەڵ مێژووی کۆچ کردنی کوردەکان لە کاتی فەرمانڕەوای شا عەباسدا دوو سەد ساڵ لە پێشترە.

دیـان لە پەرتووکی « منم تەیمور جهانگشا، کۆکردنەوەی مارسل بریون لە لاپەرە ٦٣ تەیمور ئەڵێت: من کاتی گەیشتمە « قوچان » خەڵکێکم بینی بالا بەرز و لاشەیان بەهێز و هەریەکەیان دارێکی درێژ و قەویان بە شانەوە بوو، ئەیان ویست هێرش بهێننە سەرمان و کە ئێمەشیان دی بە هیچ جۆرێک لە ئێمە نەترسان: هەندێک لەوانە چارکاڵ و موو زەرد، بە زمانێ قـەیان دەکرد ئەفارسی و نە عەرەبی بوو لێم ڕوون بووەوە کە ئەوانە کوردن و لە کوردستانەوە کۆچیان پێکردوون و لە قوچان نیشتەجێ بوون. چونکە پیاوانی کورد لێهاتوو بوون، چەند کەسێکم داواکرد و لەگەڵیاندا دانیشتم و پێم ووتن ئایا ئارەزوو ئەکەن بێنەوە ئاو

سوپای مەنەوە و بەینە سەرباز. لێیان پرسیم تۆ کێیت وتم من تەیموورم سوڵتانی ماوراء النهر. کوردەکان وتیان ئێمە نامانەوێت لە خزم و کەس و کارمان دوورکەوینەوە و پێویستیمان بە سەربازی نیە، خاوەنی مەڕو ماڵاتین و ژیانی خۆمان باش دامەزراندووە. ئەم دیتنەی تەیموور لەنگ لە ساڵی ٧٧٨ کۆچیدا بووە، دیسان ئەمەش نموونەیەکی مێژوویە کە کوردەکان لە خوراساندا هەبووە، پێش شا عەباس کۆچیان پێکردوون لە کوردستانەوە بۆ خوراسان.

## ڕاگوێزانی کورد لە کوردستانی تورکیا

سوڵتان مرادی چوارەمی عوسمانی

لە ساڵی ١٦٣٩ زاینی تیرەی باجەلانی لە دیاربەکرەوە گوێزاوەتەوە بۆ رۆژئاوای زەهاو، دەورووبەری خانەقین و کەلوورەکانی لەوێ دەرکردووە. ئێستاش تیرەی باجەلان لە دەوری خانەقینن.

کوردەکان لە کوردستانی تورکیا، لە شەڕی یەکەمی جیهاندا تورکەکان بە هەموو تواناییانەوە کەوتنە کوشتن و سوتاندنی دێهات و ڕاگوێزان. سوپای تورکیا کە خۆی لەبەردەم سوپای ڕووسیادا پێ ڕانەگیرا بە شکاوی کشایەوە دواوە، کەوتە ڕەشبگیری لە ناوخەڵکی بێتاوانی کوردستاندا، داخی شکانی خۆیان بەوان ڕشت. لەم بارەیەوە عبدالعزیز یامولکی نووسیویەتی. سوپای تورکیا کە بەشکاوی ناچار بوو ئەرزروم بەجێبهێڵێ و بکشێتە دواوە هەڵی کوتایە سەر کوردەکان بە ماڵ و منداڵەوە بەرەو ئەنادۆڵ ڕایان گوێزان و پۆل پۆل هەموویانی پێش خۆدان. کوردەکانیش لەبەر بێ چەکی بەرەنگاریان پێنەکرا. کاربەدەستانی تورکیا بۆ ڕاگواستن و نیشتەجێ کردنی زۆردارەکی کورد، فەرمانی نهێنی و تایبەتیان دەرکرد، عبدالعزیز کە دێتە سەر باسی ڕاگوێزانی کورد بریارە ڕەسمیەکانی دەوڵەت

دەکاتە بەڵگە چونکە بڕیارە ڕەسمیەکان بە ئاشکرا باسی ئەو مەسەلەیە دەکەن. ئەمەش نموونەیەکی بەڵگە ڕەسمیەکانە:

« ئەبێت خەڵکی ناوچە پڕدانیشتووە کورد نشینەکان ڕاگوێزان و لە وڵاتی خۆیان دوور بخرێنەوە، لەو ناوچانەدا جێگیر بکرێن کە ناوچەی پڕ دانیشتوان و تورک نشینن، بە مەرجێک ڕێژەیان لە ٥٪ی سەرجەمی خەڵکە تورکەکەی ئەو ناوچانە زیاتر نەبێت، دەبێت گەورە پیاوان سەرکردە و سەرانی کورد لە وڵات و لایەنگران و خێڵەکانی خۆیان جیا بکرێنەوە، پاش ئەوە بۆ ناوچە دوورەکانی تورکیا دوور بخرێنەوە، پێویستە لەیەک دا ببڕێن و کەسیان پەیوەندیان بە یەکترەوە نەمێنێت، هەروا نابێت منداڵان و لاوان لەگەڵ خۆیاندا بەرن، نابێت تێکەڵاوی یەکتر ببن، هەموو جۆرە پەیوەندی و تێکەڵاوییەک ئەبێت بپچڕێت، بێجگە لە زمانی تورکی نابێت بە هیچ زمانێکی کە بدوێن و ئەبێت خووڕەوشتی خۆیان بگۆڕن، ئەبێت بە تەواوەتی بە کۆمەڵ و بە زۆرداره‌کی بکرێن بە تورک » ڕاگوێزانی زۆرداره‌کی کورد بۆ ناوچە دوورەکانی تورکیا لە وەرزی زستاندا دەستی پێکرد، ڕاگوێزراوەکان لە ڕێگادا تووشی برسێتی، سەرماو بەفر و سەھۆڵ بەندان بوون بە هەزار فەلاکەت و ناخۆشی دەگەیشتنە ناوچەی دیاریکراوەکان، هەر لە ڕێگادا زیاتر لە سێ بەشیان مردن، لەم بارەیەوە عبدالعزیز یاملکی نووسیویەتی « تا برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی زیاتر لە . . . . . ٧ کوردی تورکیا مردن یان لەناو بران » ژاندارمەکانی تورک کە پەلاماری کوردستانی ئێرانیاندا کاری وا دڕندانەیان ئەنجامدا مەگەر هەر لەوان بوەشێتەوە، داخی شکانی خۆیان لە بەرەی جەنگدا بە کورد ڕشت و ڕەشبگیری کەوتنە گیانی کوردە بێتاوانەکان، بە پێی ڕاپۆرتەکانی « کاوریکا » کە یەکێکە لە سیاسیەکانی رووس ئەڵێت تورکەکان لە یەک هێرشی کتوپڕدا . . . .٢،٠ کوردسان کوشت، ناوبراو لەم

بارەیەوە نووسیویەتی تورکەکان سکی پیاوانی کوردیان هەلدڕی، مەمکی ئافرەتیان بڕی تەنانەت بەزەییان بە کچە ساواکانیشدا نەدەهاتەوە ». هەر لەم بارەیەوە عبدالعزیز یاملکی نووسیویەتی:

« پێویست ناکات هەموو تاوانە ڕزیوەکانی تورک لە کوردستاندا بژمێرین، هەر ئەوە بۆخۆی گەورەترین بەلگەیە کە بە درێژای ڕێگای نێوان کرماشان و خۆرئاوای خانەقین لاشەی جوتیارە کوردەکان کە بە دەستی تورکەکان کوژرا بوون ومن بە هەردوو چاوی خۆم دیومن بەمەلار لای ڕێگاکەدا فڕێدرابوون » یا ملکی پێی وایە تەنها سوپای رووسیا کوردی ئێرانی لە کوشتارە نامرۆیەکانی تورک رزگار کرد. لە سالی ١٩٠٥-١٩١٤دا تورکەکان لەگەل دەولەتی کۆنەپەرستی ئێراندا ڕێک کەوتن، کوردستانی رۆژهەلاتیان داگیرکرد لە ئەنجامی کوشتار و لەشکر کەشی داگیرکەراندا برسێتی و گەندەخۆری و کەم بەرهەمی سەرتاسەری کوردستانی تەنیەوە، زستانی سالی ١٩١٨دا نیوەی خەلکی کوردستان برسێتی هەراسانی کردن، ئەوانەی بە دەستی داگیرکەران کوژران و ئەوانەی لە برسانا مردن، هەروەها ئەوانەی لەکاتی راگوێزانی زۆردارەکی لە سالانی جەنگی یەکەمی جیهاندا بەرگەی بەفر و سەرما و سۆلەیان نەگرت و مەرگ تەنگی پێهەلچنین ژمارەی ........٢٠٠ کەس دەبێ کار گەیشتە رادەیەک ئەو زەویانەی بە کەلکی کشتوکال ئەهاتن لە سێ بەشی بەشێکی کەلکی لێ وەردەگیرا، ئاژەل و ڕەشە ولاخ بە رادەیەک کەم بوو بوو بە ئەندازەیەک کە لە چارەکی جاران کەمتر بوو. زیانی گەلی کورد بەم جۆرە بوو:

١٥,٢٠٦ کوژراو، سوتاندنی ٨,٧٥٨ خانوو، کاوول بوونی ٢٠٦ دێ، تورکەکان بۆ سزادانی کورد کەوتنە چۆلکردنی بەشێکی ناوچە کورد نشینەکان و راپێچ کردنی خەلکەکەی بۆ ناوچە دوورەکانی تورکیا ئەم کارەش لە وەرزی زستاندا جێبەجێ کراو لە ئەنجامدا بەشی هەرە زۆری

ڕێنچراوەکان لە ڕێگا تووشی بەفر و سەرماو سۆڵە بوون و پێش ئەوەی بگەنە جێگا دیاریکراوەکان بەشێکی زۆریان مردن.بەم شێوەیە لە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٢٥-١٩٢٦ لە ئەنجامی تاوانەکانی تورکیادا زیاتر لە ٥٠٠,٠٠٠ کورد مردن، تورکەکان تا شۆرشەکەی کوردستانیان پێ کوژایەوە ٥٠,٠٠٠ سەربازیان لێ کوژرا. پاشان لە ٢٧ی حوزەیرانیدا دادگای تورک بڕیاری خنکاندنی ٤٧ تێکۆشەری دەرکرد لە شاری دیاربەکر هەڵواسران، لە ڕۆژی ٢٨ حوزەیراندا هەمان دادگا بڕیاری خنکاندنی ٩٣ تێکۆشەری تری دەرکرد ئەوانیش هەر لە دیاربەکردا هەڵواسران، پێشتریش ٩١ کەسی تر هەڵواسرا بوون، حکومەتی عیسمەت ئینینۆ ئەم بڕیارانەی خوارەوەی دژی میللەتی کورد دەرکرد :

١- لەناوبردنی بە کۆمەڵ، سوتاندنی دێهاتەکان و ڕەفتاری تری دڕندانە.

٢- نەهێشتنی چەک لە کوردستاندا و سزادانی ئەوانەی چەکیان پێدەگیرێ.

٣- ڕاگوێزانی ژۆرداوەکی کورد ب ناوچە دووره تورک نشینەکان و نیشتەجێ کردنی ئەو تورکانەی لە گریک و بەلکان دەرکرا بوون لە کوردستاندا.

## کوردستانی باشور

کوردستانی کاولکراو بە کیمیابی ناودراو. لە لایەن داگیرکەران و حزبی عەفلەقی... کە بە ڕێگای نا سەرمایەداریدا سۆسیالیزمی دروست نەکرد !! لە ٨ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣دا ئەم حزبە بوونە فەرمانڕەوا، عێراقیان کردە گۆمی خوێن بە هەزارەها کوژراو بە ئەشکەنجە و ئازار و بە هەزارەها بەندیخانە پڕ کرا لە نیشتمانپەروەرو بێ لایەن لە ژن و منداڵ و پیر و گەنج، ڕەشەکوژی گەیشتە رادەیەک بە ئارەزووی پاسەوانەکان «

حەرس قومی » هەرچی بکردایە نەیان کرد بێ بەزەیی... تەنانەت لاشەی کوژراوەکانیشیان نە ئەدایەوە، هەموو مافی مرۆڤیان پێ شێل کرد.

لە مانگی ۱۰ حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳دا پاش ئەوەی ئەختێ خوێیان چەسپاند و لە هێزە دیموکراتیەکانی کەیان داو بێ هێزیان کردن، پاش ۳ مانگ کەوتنەوە شەڕ لەگەڵ گەلی کورددا، کوشتن و گرتن و سووتاندن و ڕەشبگیری دەستی پێکرد، بە کۆمەڵ کوشتن و ئازار و ئەشکەنجە ئەمەش هەرچی کورد بوایە لای ئەوان ئەوان تاوان بار بوو... لە هەمان ڕۆژدا پەلاماری دیهاتی ناوچەکانی کوردستانیاندا بە هەموو جۆرە چەکێکی کوشندە و بە فڕۆکە هەرچی لە توانایاندا هەبوو کردیان، قەدەغە کردنی خواردەمەنی و شتومەک لە شارەوە بۆ دیهات، سووتاندنی گەنم و گێو، دەغڵودانی جووتیارەکان. ئەم حزبە ساڵی پڕ نەکردەوەو لە ناو چوو... پاش ئەوەی کوردستانیان کردە گۆمی خوێن.

دیسان ساڵی لە ١٩٦٨وە بوونەوە فەرمانڕەوا لە عێراقدا، جاری پێشوویان چیان کرد دیسان بەو شێوەیە کەوتنەوە کوشتن و بڕینی میللەتی کورد. بەڵام بە هۆی بوونی هێزی چەکداری گەلی کوردەوە نەیانتوانی زۆر جێگا بگرن و ناچار لە ساڵی ١٩٧٠دا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقدا پێک هاتن و حوکمی زاتی درا بە گەلی کورد لە ١١ی ئازاری هەمان ساڵدا... پاشان وردە وردە پاشە کشەیان لێکرد و لە ١٩٧٤/٤/١٠دا اعلانی شەڕیان کردەوە لەگەڵ گەلی کورددا... بەوەی کە نزیک بوونەوە لەگەڵ هەندێ کۆمەڵ و لایانی کە و هەڵخەڵەتاندنیان و ئەوانیش پاڵپشتی ئەم حزبەیان کرد و چەند هۆیەکی سەرەکی‌کەش هتد. لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٧٥دا پاش ئەوەی هێزی چەکداری دیموکرات هەرەسی هێنا کەوتنە ڕاگوێزانەوەی هەزارەها دێهاتی سەر سنوور، بەزۆر بەم لاو لادا نەیان بردن... جگە لە کوشتن و ئازاردانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد، هەموو

نەخشەکانی عەفلەقی بریتی بوو لە ناوبردنی کوردی کوردستانی عێراق. لە کاتێکدا کە بەرەی نیشتمانی هەبوو لە نێوان حزبی بەعث و حزبی شیوعی و یەک دوو حزبی دروستکراوی کارتۆنی کە بەم هەموو کارە ناهەموارانە هەڵسا.

**خاکی کوردستانی باشور**: رووبەرەکەی ...,٨٦ کم٢، لە ڕێبازی نوێ ت یەکەمی ساڵی ١٩٨٨. هەرچەندە لە لاپەڕە ١٧ دا ٨. کم٢ هاتووە لە لاپەڕە یەکەم ٧٢کم٢. دەکەوێتە باکور و باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراقەوە. سنوورەکەی بە هێڵێکی ڕاست لە سنوری عێراق و ئێرانەوە بەرەو ڕۆژئاواوە دەکشێت، تا دەگاتە خوارووی جەسان، لەوێوە هاوشان لەگەڵ سنووری عێراق و ئێران بەرەو ڕۆژئاوای بەلەدروز و شارەبان دەڕوان، لە وێشەوە بەرەو چیای حەمرین دەکشێ، ئەنجا بەرە و باکوری ڕۆژئاوا لەگەڵ زنجیرە چیای حەمریندا دەڕوات تا دەگاتە فەتحە، لە فەتحەدا لەگەڵ ڕووباری دیجلەدا بەرەو ژوور هەڵدەکشێ، هەموو ئەو زەویانەی دەکەوێتە ڕۆژ هەلاتیەوە بەر کوردستان و هەموو ئەو زەویانەش کە ڕۆژئاوایەتی بەر ناوچەی عارەبی عێراق دەکەون تا دەگاتە سەرو شاری موسڵ. لەسەر موسڵەوە بە هێڵێکی ڕاست ڕوو لە باشووری ڕۆژئاوا دەکات بە خوار تەلعەفەردا تێدەپەڕێ تا دەگاتە دە کم باکوری شاری بەعاج، ئینجا بە هێڵێکی ڕاست بەرەو ڕۆژئاوا دەڕوات لەگەڵ سنووری عێراق و سوریا یەک دەگرێتەوە.

ئەمڕۆ لە سەرجەم کوردستانی باشووردا حکومەتی عەفلەقی تەنها ٧٧٢٩کم٢ بۆ هێشتونەتەوە کە تیایدا بژین، باقیەکەی چۆڵ و وێران کردووە یا عەرەبی تێدا نیشتەجێ کردوون کە ٧٨٢٧١کم٢. دووەمین قۆناغی تەسک کردنەوەی سنووری کوردستان بریتییە لە بەعەرەب کردن و دەرهاوێشتنی بەشێکی زۆری کوردستان و ناوچە کورد نیشینەکان لە

ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان، بە گوێرەی یاسای ئۆتۆنۆمی ساڵی ١٩٧٤ و ئەو دەستکاریانەی لە ساڵانی داهاتوو دا بە سەر ئەم یاسایەدا هاتن، ئەم ناوچانەش جگە لە ١٥٩١٢کم٢ پارێزگای نەینەوا بۆ ئەوەی بە تەواوی پارێزگای نەینەوا، کە بەشێکی موسڵ و دەوروبەرەکەی دەگرێتەوە، تەعریب بکرێ و لە کوردستان دابڕێ، ناوچەکانی ئەو قۆناغە بریتی بوو لە: تەلعەفەر، شێخان، ئاکرێ و حەمدانیە، تلکێف و لەسەرجەم ڕووبەری پارێزگای نەینەوا کە ٣٧٦٩٨کم٢، ئەوا نەکاتە ١٥١٩٢کم٢، دووەم قۆناغ بریتین لە « ناوەندی کەرکوک، قەرەحەسەن، شوان، تازەخورماتو، یایچی، داقوق، قەرە هەنجیر، عەباسی، حەویجە، زاب، دوبس، ئاڵتون کۆپری، سەرگەدان کە ڕووبەرەکەی ٣٩١٠.١کم٢. لە پارێزگای صلاح‌الدین قەزای دووز کە ٤٠١٩.٤کم٢. قەزای خانەقین ٣٩١٥کم٢. قەزای مەندەلی ٦,٥٨٦کم٢یە. وە قەزای شارەبان ٥٤٢کم٢. قەزای کفری ٨٨٤١کم٢ لە پارێزگای دیالە و لە قەزای بەدرە لە ڕاست کە ڕووبەرەکەی ٣٧٤٠کم٢، قەزای عەلی غەربی لە مەیسان کە ٢٢٢٤کم٢. واتە دابڕینی ٤٩٤٤٩کم٢یە لە کوردستان و هێشتنەوەی ٣٦٣٤٧کم٢ بۆ ناوچەی ئۆتۆنۆمی. بەعەرەبکردنی تەواوی ئەو ڕووبەرە فراوانە کە لە ئۆتۆنۆمی دەرهاوێژراوە. سێهەمین قۆناغیش ڕاگوێزانی ناوچە سنوورییەکان بوو بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکان کە نزیکەی ٨٠٠٠کم٢ وە پتر لە ١٢٥٠ دێهاتی گرتۆتەوە بۆ ئەم نەخشەیە لە سولێمانیدا ئەم ئۆردوگایانە دروستکران:

پێنجوێن، ژاراوە، بەستەستێن، تووەسووران، بنگرد، ڕانیە، چوارقوڕنە، کەناروێ، کارێزە، سوورە قەڵات، قەڵاچوالان، عەنەب، سیروان، زەمەقی، خورماڵ، ڕاوگان، ئالپارێز، زاراییەن، قادسیە، تاسلوجە، ئاللایی، تەینال، تەکی بەردە سوور، ئەحمەد ئاوا، باوەنوور، نەسر، برایەتی، صمود، هتد. ئەمانە هەمووی بریتین لە ٢٩ ئۆردوگا. لە هەولێر ڕاگوێزراوەکان برانە

ئۆردوگای:

قوشتەپە، صدام، گرد مەلا-سیبیران، کانی قرژاڵە، هەڵجیرە، کەس نەزان، شاونس، پیرزین، بحرکە، بەستۆرە، دێگەڵە، دیانە، سیدەکان، گزرەتوو، کە هەمووی بریتییە لە ١٥ ئوردوگا.

لە دەرەوەی راگوێزراوەکان برانە ئۆردوگاکانی:

هیزاڤا، دەرکا عەجە، بیرسفی، باتیف، بیگوڤا، کوریتگاڤانا، باگیرات، قواس، زیرالوک، کوانێ، سیلادزە، سیری و تلکەبری، واتە پتر لە ١٢٥ دێهات لە ٥٩ ئۆردوگادا کۆکرانەتەوە.

چوارەمین قۆناغیش بە هۆی جەنگی عێراق و ئێران بۆ جاری دووەم دەیان شارو لادێی کە ڕاگوێزراونەتەوە، چەندین لەو ئۆردوگایانەش کە لە قۆناغی سێهەمبندا دروست کرابوون هەموویان ڕاگوێزرانەوە بۆ شارەگەورەکان، بە ئاوارەی و دەربەدەری کردن و لە خاکی خۆیان دەرپەڕێندران. بۆ ئەم مەبەستەش ئۆردوگای تازەی وەکو پیرەمەگرون و ئۆردوگای هەڵەبجەیان بۆ دروست ئەکات، بەم جۆرە ئێستا کوردستان لە ٨٦... کم٢ی تەنها ٧٧٢٩کم٢ بۆ کورد هێشتۆتەوە، کە ئەویش دەکەوێتە سنووری شارەگەورەکان و دەوروبەری جادە گشتییەکان.

قۆناغی ئەم دواییەش ساڵی ١٩٨٩، شارۆچکەی سەنگسەری ڕاگوێزا کە ...١٢ کەسی تێدا بوو وە ...٢٤ خانوو بەرە کە ناوەندی ناحیەی نادەشت دەکەوێتە ١٣کم باکوری رۆژئاوای قەڵادزێ، وە ٨١کم دووری لە باکوری رۆژئاوای سولێمانیەوە پاش ئەوەی ڕاگوێزان شارۆچکەکەشی تەخت کرد. هەروەها ڕاگوێزانی ژاراوە، تووەسووران، کە دوو کۆمەڵگا بوون لە قەڵادزێ نەوانیشی ڕاگوێزا، لە سەرەتای مانگی ٦ ساڵی ١٩٨٩ دا ئاگاداری دێهاتەکانی دۆڵە ڕەقە و دۆڵی شاور، ناوچەی بیتوین، هەموو گوندەکانی سنووری رانیە ئاگادار کراون دێهاتەکان بەجێبهێڵن و بێنە

دەوری رانیە. هەروەها دێی قادرئاوا، ماخۆیزنان، سورکان، حیلک، مەمک، ئەمانیش هەموو ئاگادار کراون وە رایان ئەگوێزن.

*ئەمەیە کارساتی ناهەمواری عەفلەقیەکان بەرامبەر بە گەلی کوردی* کوردستانی باشور، هەروەها ئاگاداری قەلآدزێ کراوە ئەوانیش هەموو راگوێز ئەکەن، ئەمەش کە باخ و بێستان و کێڵگە لە کوردستاندا واز لێ ئەهێنرێت بە زۆرە ملێ کە بۆتە هۆی گرانیەکی زۆر... لە کاتێکا ئەمەم نووسی هێشتا قەلآدزێ رانەگوێزرا بوو، پاشان ئەویش راگوێزرا و ئەو شارە مێژووییە هەمووی تەخت کرا. شاری قارەمانی هەڵەبجە، شاری شەهیدان، سێهەم شاری جیهان لە دوای ناغازاکی و هێرۆشیما لە ١٩٨٨/٣/١٦دا رژێمی عەفلەقی بە ٨ فرۆکە و شانزە جار بە دەبان بۆمبای کیمیاوی یان لە شاری هەڵەبجەدا و لە ئەنجامی ئەم تاوانەدا ٥ هەزار شەهید و زیاد لە ١٠ هەزار کەس بریندار کران و خێزانی وا هەبوو کەسی لێدەرنەچوو، منداڵی ساوا لە باوەشی دایک و یان بە کۆڵی باوکیەوە شەهید بوون.

روو بەری هەڵەبجە ١٥٢٣کم٢ زیاتر لە ٧٥ هەزار کەس تەنها لەناو شاری هەڵەبجەدا ئەژیان، هەروەها رژێمی عەفلەقی سەدەها دێهات و شارۆچکەی تر لە کوردستاندا کیمیاوی بەکار هێناوە، کە بۆتە هۆی شەهید بوونی هەزاران کەس لە دانیشتوانی دێهاتەکان. لە سەوسێنان لە ١٩٨٨/٣/٢٢دا ٧٥ کەس منداڵ و ژن و پیرەژن و لاو شەهید کران، بەسەدەها بریندارێش، لە شاناخسێ و تۆلەرور، سەدەها دێکەی کوردستان کیمیا رژاندو بە هەزارەها منداڵ و ژن و پیر و لاو شەهید کران و بەهەزارەهاش بریندار کران، ئەمەش هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە. هەر لە دوای ساڵی ١٩٧٥وە بە هەزارەها رۆڵەی کورد بە پەتا کران پێش بە پەتا کردنا، زۆریان لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا لەت و پەت کران و

چاویان دەرئەهێنان و لاشەیان بە ئاگر ئەسوتاندن، هێندێک لەوانە تەمەنیان لە نێوان ١٤-١٧ ساڵاندا بووە، تەنانەت لاشەکانیشیان نە ئەدانەوە بە خاوەنەکانیان، ئەوانەی گوللە باران ئەکران پارەی گوللەکانیان لە خاوەنی شەهیدەکان ئەسەندەوە، هەریەکێک کەمێک شتی لەسەر بوایە ئەبێت نەمێنێت، بە ئازار کوشتن یان بە بەتا کردن و گوللە باران. ئەمانە هەمووی بەلایەک لە ١٩٨٨/٣/٢٢دا دەستکرا بە هێرش کردن بۆ ناوچەکانی بازیان و قەرەداغ و گەرمیا، پاش مانگێک هەرچی دانیشتوانی گەرمیان بوون گیران، لەگەڵ هەندێکی ناوچەی قەرەداغ و بازیاندا، تا ئێستاش بێ سەرووشوێنن، زۆریان لەوانە لە برساندا مردوون، کچ و کوڕی تازە پێگەیشتوو فرۆشراون، گەنجەکانیان کوژراون و پیرەژن و پیرەپیاریش مردوون و کوشتونیان. ئەمەیە کاری تاوانی بەعث « سعایە، انفاله » هەرچی دەست بکەوێت لە کوردستاندا کچ و ژن و منداڵ و ماڵی و ئاژەڵ بۆ ئەوان هەمووی ڕەوایە، هەرچی بوو هەموو تالأن کرا، لەو هێرشانەدا ١٨٢ هەزار کەس شەهید کراونە کاتی ئەنفالەکاندا، هەرچی دێهات بوو رووخێنراو سووتێنرا، دوای هێرش بۆ بازیان و قەرەداغ و گەرمیان، هێرشیان کردە سەر ناوچەی ئاغجەلەر، پاشان ناوچەی کۆیە، ناوچەی شەقلاوە، ڕەواندوز، هەموو ناوچەی بادینان وای لێکرا، خەڵکێکی زۆر ئاژەڵ و ڕەشە ولاخ و ناوماڵیان بەجێهێشتووە بە سکی رووتی و برسێتی و هیلاکی خۆیان گەیاندە ناو سنووری ئێران و تورکیا، ئەوانەی تورکیا لە زستاندا لە ژێر چادر دا ئەژیان ، و ژیانیان زۆر تاڵ بوو هەر هەفتەی دەها منداڵیان ئەمردن بە هۆی سەرماو بێ دەرامەتیەوە. بەڵێ هەموودێهات و شارۆچکەکانی کوردستانی باشور ئەما، باغ و باغات هەمووی وشک بوو، تەنانەت گۆرستانەکانیشیان تەخت و بێ شوێنەوار کرد لەکتایی سەدەی بیستەمدا بێگوێندانە هیچ ڕەوشتێکی مرۆڤایەتی، بەو پەڕی دڕندەیەتیەوە

کەوتۆتە گیانی گەلی کورد، بە مەبەستی تواندنەوەی و سڕینەوەی لەسەر نەخشە. ئەمە بوو کردەوەی داگیرکەران، بەڵام ناتوانن کورد لەناوبەرن و کوردستان بگۆڕن بە عەرەب، ئەوانەی پێشتر بەو نیازە هەوڵیاندا هەر بەو مەبەستە وەک ئەکەدیەکان و بابلیەکان و ئاشوورییەکان رووخان و لەناوچوون و مێژووش تا ئێستا باسی کردەوەی دڕندانەی ئەوانە ئەکات. سەبرێکی مێژووی کۆن و دوژمنایەتی ئەو لایانە بەرامبەر نەتەوەی کورد.

* * * *

« ٤ »

# کورتەیەك لە مێژووی کۆنی نەتەوەی کورد

دەستدرێژی داگیرکەران و ئازار و ئەشکەنجە و ڕاگوێزان لە مێژووی کۆندا. کورد ئەڵێت ڕەگ بەرکێشە و تۆو بە بنە تۆو. لە مێژووی کۆندا ئەکەد و، بابل و ئاشوورییەکان، سەرجۆن« ئەکەدی، وەئەکەد: ئەکەد ناوی شار و ناوچەو ئیمپراتۆرەکەش بووە.وە ئەکادو پایتەخت بووە، سۆمەرییەکان پێیان وتووە ئەجادی، وڵاتی ئەکاد ناوچەی باکووری سۆمەر بووە بە درێژایی لە ئەی یپوورەوە تا سامەرا بووە. ئیمپراتۆری ئەکاد هەموو هیلالی خەسیب بووە، کە سەرجۆنی ئەکاد دەستی بەسەرا گرتووە ماوەی ۱۲. ساڵ فەرمانڕەوایان کردووە. لە ساڵی ۲۳۵. -۲۲۳.پ.ز لە گەلانی سامین. لەگەڵ سۆمەرییەکاندا ژیاون، دوو گەلی جیاواز بوون وە زمانیشیان جیاواز بووە. سەرجۆنی ئەکەدی ۲۳۵۵ -. .۲۳، ناوی خۆی شروکین « مەلیکی شەرعی » باش ئەوەی پێ گەیشت بووە مەبگێڕی مەلیکی ئور زابابا مەلیکی کیش. بەم هۆیەوە توانی دەسەلات بگرێتە دەست، شاری ئەکادی دروست کرد لە سەر ڕووباری فورات و کردیە پایتەخت و زمانی

ئەکەدی کردە زمانی رەسمی بە تەنیشت زمانی سۆمەریەوە، پاش ئەوە خۆی چەسپاند و بەهێز بوو لە دیجلەوە پەڕیوە بەرەو ئێران. ئیلامی داگیرکرد... باشان بەرەو ناوچەکانی گوتو و لۆلۆ کشا، وەبە شەڕ هات و لە ناوچەی کرماشان لەگەڵ چوار لەشکردا بەشەر هاتووە بەسەرزکابەتی مەلیکی ناوان... لەشکری مەلیک ناوان شکا و خۆشی کوژرا کەوتە تالان و سوتاندنی دێهات و بە دیل بردنی ژن و پیاوی ئەوناوچانە لە گەرانەوەیدا شاری « هارهار »ی گرتووە کە ئەبێت پایتەختی « لولو » بوو بێت، ناوی شارەکەی گۆڕیەوە بە « کارشارۆکین » بە زمانی ئەکەدی واتە « شاری سەرجۆن » ئەمین زەکی لە کتێبەکەیدا کورد و کوردستان ئەڵێت: رەنگە هەڵەبجەی ئێستا یان گردی « بەکراوا »ی نزیک هەڵەبجە بێت، لە لایەکی کەش ناوی هارهار بە ناوچەیەک هاتووە. کوشتن و سووتاندن و ئەوەی بەکەڵک هاتبێت بەدیلی هێناویەتی... دیلەکان بە رووت و قووتی و دەستیان لە دواوە بەستراوە.

پاشان هوریەکان و سوبارتوی گرت و لەوێش سوتان و بە دیل بردنی خەڵکێکی زۆر... پاشان سوبارتو شۆرشیان کرد و ئازادی خۆیان وەرگرتەوە، سەرجۆن چوە سەریان کەوتە کاولکردنی شار و دێهات و بە دیل بردن، لە نووسینێکی ئەکەدیا هاتووە ئەڵێت « هەتا چۆلەکەش جێگای مانەوەی نەما » پاشان سەرجۆن لە فورات پەریەوە « ولاتی مەبطاشمش »ی گرت هەروەها سوریا تا دەریای خۆرئاوای ناوەراست، وە ئونیەو ئوبرسی گرت، هەروەها دلمون « بەحرێن » ئەم ئەمپراتۆرە هەموو هیلالی خەسیب لە تورسەوە تا کەنداو وەلە زاگرۆسەوە تا دەریای ناوەراست لەگەڵ ئوبرسدا. هەرێمەکانی ژووررو لوللو گوتو لێهەڵگەرانەوە بەشەڕ چووە سەریان دیسان وەک جارانی پێشووی لێکردن.

فەرمانڕەوایی سەرجۆن ٥٥ ساڵ بوو

پاش مردنی شروکین کورەکەی لە جێ‌نشینی بە ناوی ریموس « ۲۲۹۱-۲۳۰۰ پ.ز کەوتە کوژاندنەوەی شۆرشەکان لە سومەر و ناوچەکانی زاگرۆس و ئەویش هەروەک باوکی بوو کردەوەی، لە کاتێکا هێرشی ئەبردە سەر ایلام لە لایەن سەربازەکانی خۆیەوە کوژرا، ۹ ساڵ فەرمانڕەوا بوو.

مانیشتوزو ۲۲۹۱-۲۲۷۵پ.ز برای شروکیە بوو، فەرمانڕەوای ئەکەد، خۆیان بە دوژمنی سەرۆکی گەلی لولو دائەنا لە رۆژهەلاتەوە گوتیەکان شاخەکانی زاگرۆس و ایلام لە باشووری رۆژهەلاتەوە بەردەوام شەڕیان لەگەڵ لولو و گوتو دا کردووە و زەرەری زۆریان لێداون. ۱۵ ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە، دوای خۆی کورەکەی نارامسین. ئارامسین « حبیب سین » لە ساڵی ۲۲۷۵-۲۲٤۰پ.ز » بووە فەرمانڕەوای ئەکەد، پەلاماری هوریەکانی دا کە هەڵگەڕابوونەوە، بەشەڕهات و پاش شەڕێکی خوێناوی سەرکەوت. پەیکەرێکی لەوێ بەجێهێشت لە دیاریەکرد ئامەد » دیسان پەلاماری لولویەکانی دا و باش شەرێکی قورس و خوێناوی، لەشکری لولو شکاو مەلیکەکەیان بە ناوی « سنتونی » هەڵهات. بۆ ئەم سەرکەوتنە پەیکەرێکی خۆی لە دەربەندی گەور دروست کرد لە قەرەداغ لە باشور و خوارووی سولێمانیەوە، هەروەک ئەو پەیکەرە، پەیکەرێکی کەی « سەرکەوتن » کە ئێستا لە مۆزەخانەی « لۆڤەر »، لە فەرەنسا، کلاوێکی لەسەردایە دوو شاخی پێوەیە کە نیشانەی هێز و خوایەتی نیشان ئەدات... کەوانێکی بە دەستەوەیە کە نیشانەی سەرکەوتنە، لەگەڵ ڕمێکا، بەسەر شاخێکی سەختدا سەرئەکەوێت و لەژێر پێیدا سەربازی لوللوەکان کەوتوون، نووسراوەی سەرپەردەکە سەرکەوتنی ئارامسینە بەسەر « سنتونی » ئەوپەردەش لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لە شاری شووش دۆزراوەتەوە لە ئیلام. لەم هێرشەدا لولوییەکان زەرەرێکی زۆریان لێکەوت، کوشتن،

سوتاندنی دێهات و تالاّن و بردن، دیلەکانیان بە ڕووتی و لە پشتەوە دەست بەسراو پەتێکیان ئەکردە ملی چەند کەسێکیان و ڕایان ئەکێشان و زۆریشیان بە ئازار و ئەشکەنجە ئەکوشت. ئارامسین جگە لەوەی ناوی خۆی نا مەلیکی ئەکەد، دوو نازناوی کەی هەبووە « شارکیرات اربعیم » بە واتە مەلیکی چوار لا، وە « شارکشتی » بە واتە مەلیکی جیهان بە زمانی ئەکەدی.پاش مردنی کورەکەی بووە فەرمانڕەوای ئەکەد.

شار کلیشاری « مەلیکی هەموو مەلیکەکان » لە کاتی ئەمدا شۆرش لە زۆر لا بەرپا بوو بە تایبەتی لولو وە گوتو، ناوبراو بەهێز بوو، مەلیکی ئیلام سەربەخۆی خۆیانی وەرگرتەوە، سۆمەریەکان بە شۆرش هەڵسان، لە سوریا ئامورییەکان هەڵسان و جیابوونەوە. شارکلێشای لە کۆشکەکەی خۆیدا کوستیان لە ساڵی ۲۲۳۰پ.ز لە فەرمانڕەوای ئەمدا شۆرش لە لایەن لوللوییەکانەوە دەستپێکرد، لوللو و گوتو یەکیان گرت و پەلاماری ئەکەدیان دا و دوا فەرمانڕەوای ئەکەد کۆتایی پێهێنرا. ئەم پەلامارەش هۆی کەی لەسەرەتای فەرمانڕەوای سەرجونەوە تا دوا فەرمانڕەواییان هەموو ناوچەکانی لولو و گوتو واتە کوردستانی ئێستا بەردەوام هێرش ئەکرا بە سەریان و کوشتن و تالاّن و سوتاندن و دیل بردن. لە نووسینەکانی سەرجوندا ئەم ویلایەتە بچوکانە ناویان هاتووە: لە باکوری خوارووی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس، نوریلیوم « اربیل » و هەولێری ئێستا، لە باشوری ئەربیل و دەولەتی « شیمورروم » « ئاڵتون کۆپری » ئێستا لەسەر زابی بچووک، لە بەشی باشوری ئەم ناوچەیە « هارش » بووە کە توز خورماتووی ئێستایە. وەلە کێوەکانی ڕۆژهەلاتی کەرکوک، ولاّتی کیماش بووە، تیرەی لولوی لە « گنهر » شۆرشیان کردووە چەند جارێک کەوتۆتە نێوان « گەهوارکڕند » لە سنووری ئێستای کرماشاندا دێیەک هەیە پێ ئەڵێن « گنهر » لە باشوری ویلایەتی مرهش یان برهش، پاشاکانی بابل

بەسەر وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتیان هێنایەوە ژێر دەستی خۆیان.

## لولو و گوتی:

لولو ئەمانە بە باپیرە گەورەی لووڕ ئەژمێرێن وەلە زەهاو کرماشان و شارەزوور و سلێمانی ئێستا دانیشتوو بوون، کۆنترین بەڵگەیەک دەربارەی لولو کە لەبەردەستایە نووسینی ئارامسینە لە سنووری ساڵی ٢٢٦٥پ.ز نووسراوە کە پێشتر باسکرا و ئێستا لە مۆزەخانەی لۆڤەرە و مجسمە پەیکەرەکەی لە دەربەندی گەورەی قەرەداغە. بەڵگەی دووەم ئەگەرێتەوە بۆ وێنەی ئانوبانینی پادشای لولوبەکان بووە لە ناوچەی زەهاو کرماشان. پادشا بە ئامادەی بەرامبەر بە خوای ئیشتار کە ئەو ئەمی سەرخستووە بەسەر دوژمنەکاندا، پێیەکی لەسەر یەکێک لە دوژمنەکان داناوە کە لە سەر زەوی کەوتوتەوە، جلو بەرگی خواکە و شا بە جوانی دیارە، ئەم خوایە بەدەستێکی نیزەیەکی گرتووە وە بە دەستەکەی تری پەتێکی پێیە کە یەکێک لە دیلەکان ببەستێتەوە، دیلەکانی کە هەموو وەستاون و دەستیان لە پشتەوە بەستراوە. وەلەسەر بەردەکە نوسراوە بە نووسینی میخی، ئەم نووسینە کۆنترین نووسینێکە کە ناوی لولویی ئەبات لەکاتی زنجیرەی دووەمی پاشاکانی شاری نوردا.

لولویی وەک وتمان خاوەنی زەهاو شارەزوور و سلێمانی بوون هەموو ئەمناوچانە و دەوروبەری کفریش لەژێر دەستەلاتی ئەماندا بووە. لە نووسینێکی قوڕیدا ناوی پادشایەکی لولو هاتووە کە لەسەردەمی سەرجون ئەکەدیدا بووە ناوی « ایماشکوش » بووە لە مۆزەخانەی لور پارچە بەردێک هەیە، ئەگەرێتەوە بۆ سەرەتای زنجیرەی بابل . . . ٢ پ.ز لە پشت بەردەکە نووسینێک هەیە باسی وولاتی اریها ئەکات کە پارچەیەک بووە لە وڵاتی گوتی، لەسەر سنووری ڕۆژهەڵات بووە. بەڵگەی زۆر ناسراو

له لەوحەكانی كەركوك دا هەیە كە لە شاری كۆنی آرپهادا بەدەست كەوتووە، جێگەی كۆنی گوتییەكان بووە لە رۆژهەلاتی ئاشور.گوتی جێگای ئەمانە هەموو رۆژهەلاتی شارەزوور و بەشی باكور بووە. رەشید یاسمی ئەلێ: كەركوك پایتەختی گۆتییەكان بووە بە ناوی ئارپها.

## هێرشی گوتی بۆسەر ئەكەد:

له سالی ۲۲۳۰-۲۱۳۰پ.ز فەرمانڕەوای ئەكەدیان كردووە، زیاد لە سەدەیەك فەرمانڕەوا بوون، لە مەلیكە بەناوبانگەكانی گوتی « كودیە » كە ئازادی سیاسی و بازرگانی داوە و پەرستگای زۆری دروستكردووە. هێرشی گوتی بۆسەر ئەكەد و نێوان دوو رووبار، یەكەم هێرشێكە كە لەكاتی مێژووی ئاسیای خۆرئاوای كۆندا باسكراوە. رەشیدا یاسمی لە كتێبەكەی « كورد و پەیوەستەگی نەژادی ئەو » دا ئەلێت گوتیەكان ۱۲٤ سالْ فەرمانڕەوا بوون. لە لایەكی كە ۱۲٥ سالْ و ٤٠ رۆژ نووسراوە. ئەگەربەراوردێكی نووسینەكانی بابلی بكرێت و كۆبكرێتەوە ئەكاتە ۹۱ سالْ و چل رۆژ ئەم زیاد و كەمیە ئاشكرا نیە، وە ۲۱ مەلیكیان فەرمانڕەوای نێوان دوو رووباریان كردووە. ئەمەش ناوی پادشاكانی گوتیە كە فەرمانڕەوای ئەكەدیان كردووە.

۱- ایمتا ناوی تەواوی ایمبیات بووە۳ سالْ فەرمانڕەوایی
۲- این گیشو ٦ سالْ فەرمانڕەوایی
۳- كی كی لاگاپ ٦ سالْ فەرمانڕەوایی
٤- شولە ٦ سالْ فەرمانڕەوایی
٥- الولومش ٦ سالْ فەرمانڕەوایی
٦- آلی مابا كیشا ٥ سالْ فەرمانڕەوایی
۷- ایگش هرش ٦ سالْ فەرمانڕەوایی

| | |
|---|---|
| ٨- ابرلاگاب | ١٥سالْ فەرمانڕەوایی |
| ٩- ابیاتە | ٣ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٠- یارلا | ٣ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١١- کوروم | ١ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٢- نیدبن | ٣ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٣- رابئوم | ٢ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٤- ایرارزم | ٢ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٥- ایرانوم | ١ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٦- هابلوم | ٢ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٧- پوزورسین کوری هابلوم | ٢ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٨- یارلاگاندا | ٧ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ١٩- انری داپیزە | ٦ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ٢٠- ............... | ٧ سالْ فەرمانڕەوایی |
| ٢١- تیریگان | ٤٠ رۆژ |

انری داپیزە لە خشتەیەکدا لەشاری نەیپور دۆزراوەتەوە، گەورەترین شای گوتی بووە، فەرمانڕەوای خۆی زۆر فراوان کردۆتەوە. تیریگان دوا پاشای گۆتی بووە کە ماوەی ٤٠ رۆژ فەرمانڕەوای کردووە وەبە دەستی اورتوهیگان اوتوزنلۆگال لابرا کە پاشای شاری ارنج « سۆمەر » بوو سالی ٢١٣٠پ.ز فەرمانڕەوای گوتی تەواو بوو ئەم تیرانە گەڕانەوە ناوچە کێوەکانی خۆیان، وورده وورده دەوڵەتی گوتی کەم و بچووک بوەوە، وە، مەلبکی تیرە پەیدا بوو. دوای نەمانی فەرمانڕەوای گوتی لە سالی ٢١٣٠ پ.ز دا لە شاری وەرکا لە ٢١٣٠ پ.ز سەرکردەیەکی سۆمەری بەناوی « ئوتوهیگال » توانی ولاتەکەی لەژێر دەستی گوتیەکان رزگار بکات لە

نووسراوە میخیەکاندا نووسراوە کە چۆن لەشکری گوتی بە سەرکردایەتی « تریکان » شکان زنجیرەی سێهەمی ئور ۲۱۱۳-۲۰۰۶. پ.ز کۆتایی هات بە فەرمانڕەوای ئوگرهیگاڵ لە وەرکادا، وە دانانی زنجیرەیەکی تازە لە شاری ئورکا، ناسراو بە زنجیرەی سێهەمی ئورکە بە دواو زنجیرەی سۆمەری دا ئەفرێت لە مێژوودا ئورنمو ۲۱۱۳-۲۰۹٦. پ.ز دامەزێنەری ئەم زنجیرەیە.
دوای مردنی خۆی کوڕەکەی لە جێی دانیشت بە ناوی « شلگی کوڕی ئورنمو » وە ٤٨ ساڵ فەرمانڕەوای کردووە لە ساڵی ۲۰۹٥-۲۰٤۷. پ.ز ئەم پاشایە لەگەڵ تیرەکانی زاگرۆسدا شەڕی کردووە، ولاتەکەی فراوان کردووە، پەلاماری ولاتە شاخاویەکانی زاگرۆسی داوە و شەڕی لەگەڵدا کردوون و داگیری کردوون. لە ساڵی حەوتەمینی فەرمانڕەوایدا پەلاماری « در ـ بەدرە »ی ئێستای داوە پاش شەڕێکی خویناوی داگیری کردووە، کوشتن، سوتاندنی دێهات و شار، تالان و بە دیل هێنانی خەڵکی، پەیکەری خوای نستیرەکان کە لە پەرستگای در ــ بەدرە بوو هێناویەتیەوە. لە ساڵی هەشتەمی فەرمانڕەوایدا چۆتە سەر ویلایەتی « کازالو » لە رۆژهەلاتی دیجلە، پاش شەڕو خوێن ڕشتن، کوشتن، سوتاندن، تالان و بە دیل هێنانی خەڵکێکی زۆر، لەوێش پەیکەری خوای « نومۆشدا »ی هێناوە، دوای ئەوە شولگی کەوتە داگیرکردنی ویلایەتەکانی رۆژ هەلات و باکور تا گەیشتە ویلایەتی مرهش، کچەکەی خۆی دا بە بایشکوی والی ئەو جێگایە. لە ۲٤ ساڵی فەرمانڕەوایدا چۆتە سەر ویلایەتی « گنهر » و پاش داگیرکردن، تالان کردن، تێک و پێکی داو، ژمارەیەکی زۆری کوشت و زۆریشی بە دیلی برد. لەوێشەوە دەستی کێشایە چەند ناوچەیەکی کەی لولوبیەکان، ویلایەتی شیمورووم « نالتونکوپری » و. ولاتی هارش و لە ساڵانی ۲۳، ۲٤، ۲٥ی فەرمانڕەوایدا دەستی بەسەرداگرتن. لە فەرمانڕەوای ۲۸ ساڵ هەمین دا

ەلاماری بردۆتە سەر شاخەکانی زاگرۆس و ولآتی « ئانشان »ی گرت،
پاشان بەرەو باکور کشا، دەوڵەتی شیمورووی بۆ سێیەمین جار
اگیرکردووە.

دوواجاری دووەم، شۆرشیان نەکرد و خۆیان رزگار نەکرد، ئەمجارە
سێیەمین جاری داگیرکردنیان بوو لە ۳۰ی هەمین ساڵی فەرمانڕەوایدا،
وشتارێکی زۆری لێکردن و تالآنی، سوتاندن، پاش ئەوەی ویرانی کرد
زۆری لە دانیشتوان بە دیل برد. لە ساڵانی ۲۹-۳۱ فەرمان ڕەوایدا،
ووبارە و سێبارە هێرشی بردۆتە سەر ویلایەتی گنهر، دیسان هەروەک
ارانی پێشوو بەو کردەوانە هەڵساوە، لەم ماوەیەدا ولآتی ئانشان بەهۆی
ازیتا پاشای سیماش یاخی بوو بوو، یارمەتیان ئەدا، لە ساڵەکانی دووا
ەرمان ڕەواییدا ئەو جێگایانەی دووره دەست بوون، وەک دانیشتوانی
ێوەکانی کوردستان، لەژێر فەرمانڕەوای ئەمدا دەرچوو بوون، شۆلگی
شکری ناردۆتە سەریان و تا فەرمانڕەوایەتی ٤٤ ساڵەی ناوچەکانی
یمورووم و شاشەروم، لولوبی، گنهر،نوریبلۆم، و هتد. چەند جارێک
ەلاماری داون و زۆری لێ کوشتوون و ماڵ و سامانیانی تالآن کردوون.

بورسین: دوای مردنی شالگی، بورسینی کوری لە جێی دانیشت. لە
رمانڕەوای ئەمدا ناوچەکانی ناوەندی زاگرۆس شۆرشیان کرد، ئەمیش بە
ندی شەری دژ کردن، هەروەک باوکی بە کوشتار و تالآن و سوتاندن،
ندێکی هێنایەوە ژێر فەرمانی خۆی، لەئەربها کەرکوکی ئێستا والیەکی
زی داناوە بە ناوی « هون هونی » دوای فەرمانڕەوای شولگی کە زۆر
رمانڕەوا بووە، ۳ مەلیک فەرمانڕەواییان کردووە، دوایەکەیان مەلیک «
بی سین » بووە ۲۳ ساڵ فەرمانڕەوای کردووە، لە ساڵی ۲۹،۲-٦،۲،۰
.ز وا دانەنرێت کە دوا پاشا و کۆتای زنجیرەی سۆمەرە، لە مێژوودا لە
نجامی هێرشی تیرەکانی ئاموری لە بەشی خۆرئاواو هەروەها هێرشی

بلامی لە رۆژهەلاتەوە، بووە هۆی رووخاندنی ئەم زنجیرەیەو بە دیل گرتنی مەلیکی سۆمەر.

## زنجیرەی یەکەمی بابل:

دامەزرێنەری ئەم زنجیرەیە پیاوێکی ئاموریە بە ناوی « سۆموئابم » لە سالی ١٨٩٤پ.ز دا، ئەم مەلیکە دیوارێکی پان و بەرین و بەهێزی بە چوار دەوری شاری بابلدا دروست کردووە، ولاتەکەی فروان کردوو توانی دەست بەسەر « بورسا، برسی نەمرود »ی نزیک بە حیلە و سەرچاوەی نەفر دا بگرێت، لە فەرمانڕەوای ئەم زنجیرەیەدا، بە ناوبانگترین مەلیکیان حامۆرابی بووە کە شەش هەمین مەلیکە لەو زنجیرەیەدا، ناوەکەی بە واتە « لالە حمو عظیم او مکثر » خوای پارێزەری گەورە. ڕەنگە ناوێش« حموڕابی » بوو بێت، ناوبراو ماوەی ٤٢ سالْ فەرمانڕەوای کردووە لە ١٧٩٣-١٧٥١پ.ز ڕووبەری ولاتەکەی لە بازنەیەکی تیرە . ٥ میلی زیاترەبووە. ناوبراو قانونی داناوە لە سالی ١٧٧پ.ز قانوونەکانی ئەبێتە دە بەش.

پاش مردنی حامۆرابی، کورەکەی بە ناوی شەمشوایلونا، بووە مەلیک لە فەرمانڕەوای ئەمدا لە هەندێ جێگا شۆرش پەیدا بوو، وەک لە شوش وە بە لارسا، نور، وەرکا، وە لە هەندێ جێگای کە باخی بوونیش دەستی پێکرد ئەمانە هەمووی لەژێر فەرمانی رەوای ئەم زنجیرەدا بوون و بە زۆر داگیرکرا بوون. لەم کاتانەدا ٣ تیرەی بەهێز یەکیان گرت، گوتی، سولو،کاشی، ئەم یەکگرتنەش بە سەرزکایەتی « گاندیش » بووە کە سەرۆکی کاشیەکان بووە. هێرشیان کردۆتە سەر بابل و سەرکەوتوو نە بوون، پاش ئەوە کەوتنە ناردنی خەلکی خۆیان بە ناوی ئیشەوە بۆ ناو شاری بابل. پاش مردنی شەمشوایلونا، کورەکەی بووە فەرمانڕەوای بابل بە

ناوی « ئیشوخ لە ساڵی ١٧١٢-١٦٨٥پ.ز » لە فەرمانڕەوای ئەمدا ئور جیا بوەوە، سەربەخۆی خۆی وەرگرت، هەروەها فوراتی ناوەڕاستی لەکیس چوو، لەو کاتانەدا وڵاتێکی تازە لە « عانە » پەیدا بوو. کاشیەکان بۆ جاری دووەم پەلاماری بابلیان دا و گرتیان، ئەمە ڕەنگە لە ساڵی ١٧٠٩پ.ز دا بوو بێت. دەربارەی گرتنی بابل و مێژوەکەی لە لایەن کاشیەکانەوە، لە ناو مێژوونووسەکاندا بۆچوونی جیا جیا زۆرە:
لە کتێبی العراق في التاريخ ئەڵێت لە ساڵی ١٥٩٥-١١٥٧پ.ز بووە.
ئەمین زەکی لە کتێبەکەی مێژووی کورد و کوردستان ئەڵێت سەدەی ١٨پ.ز دا بووەو نزیکەی شەش سەدە فەرمانڕەوا بوون.
د.محمود جواد مشکور، مامۆستای دانیشگای تاران لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی « ایران در عهد باستان و تاريخ اقوام پادشاهان پيش از اسلام » ئەڵێت کاشیەکان لە ساڵی ١٧٥٠پ.ز پەلاماری بابلیان داو گرتیان، ٥٠٠ ساڵ فەرمانڕەوا بوون تا ساڵی ١٨٨٠ پ.ز.
د. مەسعود گولزاری لە بەرگی یەکەمی کتێبەکەیدا بە ناوی « کرمانشاهان و کوردستان » دا ئەڵێت: کاشیەکان لە سەردەمی فەرمانڕەوای کورەکەی حامۆرابیدا فەرمانڕەوای بابلیان گرتۆتە دەست و ٥٧٦ ساڵ فەرمانڕەوای بابل بوون. ئەمەش لە نیوەی سەدەی ١٨ پ.ز دا بووە تا ساڵی ١١٧١ پ.ز خایاندووە.
بەپێی بەراوورد کردن لە مێژووەکاندا، لە نێوان ٥-٦ سەدە فەرمانڕەوایان کردووە تا ساڵی ١١٧١ پ.ز ـ نووسەر ـ
کاسی: ئیلامیەکان پێیان وتوون کوسی
ئاشوریەکان پێیان وتوون کاشو
یۆنانیەکان پێیان وتوون کاسی تریس بە واتە « فلز »
پێش مادەکان ناکسابا، ئاشوریەکان پێیان وتوون کار ـ کاسی بە واتە

شاری کاسیان.

ئەکدیبیەکان پێیان وتوون کاششو، وە لە هەندێ کتێبیتیدا بە کوش ناوبراون، پاش دامەزراندنی فەرمانڕەواییان لە بابل پێیان وتوون کاردونیاش. کاشیەکان لە پێش مێژوودا هەبوون، لە بەشی ژووری پشت کۆو پێش کۆ هێرشیان بۆتە سەر بابل و داگیریان کردووە.

پێشتر باسمانکرد لە لایەن زنجیرەی ئەکەد و بابلەوە بەردەوام هێرشیان ئەکرایە سەر و وڵاتەکەیان و ناوچەکانیان کاول ئەکرد و خەڵکەکانیان ئەکوشت و پاش تالان، بەشێکی زۆریان بەدیل ئەبردن، بە قسەی استرابون، پێشتر کاشیەکان لە مادۆ و رۆخی دەریای خەزەر بوون و باشان بەرەو لورستان رۆیشتوون، دوەرکان، پاش ماوەی ئەمانی لە تالش و قەفقاس دۆزیەوە، زمانیان لەگەڵ زمانی قەفقاسیدا یەک ریشە بووە، زۆرتر بە زمانی هیندۆ ئەورووپی ئەچێ، ئەمانەش وەک ماد نەژادی ئارین، زۆر شتی ئەمانە کە لە لورستان دۆزراوەتەوە، وەک ئەوانەی لە تالش و قەفقاس دۆزراونەتەوە، وەک یەکن، ئەم شتانەش ئەگەڕێتەوە بۆ ۲ هەزار ساڵ پ.ز رەنگە هەر لە زەمانی ئەم کاشیانەشدا شاری قەزوین دروستکرا بێت و ناوی دەریای خەزەر نرا بێت. کاسیەکان زۆر شەرکەر و ئازا بوون، تا ئێستاش لە گۆڕەکانیاندا خەنجەر و تیروکەوانی زۆر دۆزراوەتەوە، لە هیچ جێگایەکی ئێراندا بەقەد ناوچەی لورستان چەک نەبووە، لە سەرەتاوە خەنجەر پان بووە، پاشان تەور لە سۆمەریەکانەوە فێربوون، شتومەکی برۆنزیان بریتی بووە لە خەنجەر و تەور و تیر و سەرە نیزە، هەروەها گورزی برۆنزی و بەردیش، لە شتی جوانیدا، ملوانکە، دەستەوانە، گوارە، هەروەها بتی زۆر دۆزراوەتەوە لە برۆنز، شێوەی گلگامێشیان تیا کراوە، لە دوو لایەوە دوو کەڵە کێوی یان شێر، یان مریشکی دەنوک باریک کراوە، هەندێ لەو پەیکەرانە گیانداری تیا نیە، تەنها گلگامێشە، بە ریشەوە یان

بێ ریش، دوو بان چوار شاخ کە نیشانەی خوایەتی ئەوەو تیە کێشراوە، لغاوی ئەسپ گەورەو بچوک لە هەندێ گۆڕدا لە لورستان و تالش دۆزراونەتەوە، ئەو لغاوانەش بۆ لغاوی ئەسپ نەبووە بەشکو بۆ نیشانە بووە، دانیشتوانی لورستان لە دروستکردنی برۆنزدا لە پێش هەموو میللەتانەوە بووە، لەسەرەتای کۆچکردنیاندا بۆ ئەو ناوچانە تێکەڵ بەو خەڵکە کۆنەی ئەو جێگایانە بوون. لە هەموو کاتی فەرمانڕەواییاندا لە بابل لە رووی ژن و ژن خواستنەوە تێکەڵ بە نەژادەکانی کەی دەرەوەی ئاری نەبوون، تەنها لە نێو پاشاکاندا ژن و ژن خواستن بووە، وەک فرعونی میسریەکان لەگەڵ ئەماندا، وە ئاشوریەکان کە لە ژێر دەستەلاتی فەرمانڕەوای ئەماندا بوون، لە سوارچاکیدا بێ هاوتا بوون، ئەمان بوون بۆ یەکەم جار ئەسپیان بردۆتە نێوان دوو ڕووبار، زۆر ئەسپیان لا خۆشەویست و لا پیرۆز بووە.وە لە ڕووی رە سمی ئەسپەوە زۆر بایەخیان بە ئەسپ داوە، لەکاتی شەڕدا زۆر لایان گران و شوورەیی بووە شەڕکەرێک سواری ماین بێت، نابێت شەڕکەر سواری ماین ببێت لەکاتی شەڕدا. لە ماوەی فەرمانڕەواییاندا لە نێوان دوو ڕووبار ۳٦ پاشایان فەرمانڕەواییان کردووە.

کاسیەکان خوای خۆیانیان پەرستووە وەک نیسپاک وە سەکە، هوذا، هربە، وە کاششو لە کۆنەوە خوایان بووە و لایان پیرۆز بووە. ئەسپیان پەرستووە ئەمەش پەیوەندی کاسیەکانە بە تیرەکانی هندو ئەورووپای، ئەوانیش ئەسپیان پەرستووە. سوریاش خوای کاسییەکان بووە، کە خوای خۆرە. بۆریاش خوای تۆفان بووە. وە بوکاش « بغاش » بە واتە خوا، ئەم وشەیە لە زمانی سلافی‌دا بوگو « بغو » وەلە فارسی کۆندا بوغ بووە. یەکێک لە سەرکردە بەناوبانگەکانی کاسی ناوی اندابوگاش بووە ئەمەش بە واتە خوا.

لەناوکاسیەکاندا دوو زمان ڕەواجی بووە، یەکەم زمانی خەڵکی کە لە

ریشەی زمانی قەفقاسیە. دووە بۆ پاشاکان و ناسراوەکان بووە کەلە ریشەی هندو ئەوروپای و ئێرانی بووە. لە نووسینێکی کاسیەکاندا کە دۆزراوەتەوە ئەڵێت: ویلایەتی گوتی، پادان، آلمان، زەهاوی ئێستا، لەژێر دەستەلاتی ئەواندا بووە، لە رۆژهەلاتی باکوری بابل ناوی قەومی کاسی تا هاتنی یۆنانیەکان مابوو. یۆنانیەکان بەوانیان وتووە کیسیان وە کوسیان لە مێژووی فارسی کۆندا پێیان وتوون کوش. کاندیش یەکەم فەرمانڕەوای کاسیەکان لە بابل دا نووسینێک ماوەتەوە لەم پاشایەوە کە خۆی بە پاشای چوار اقلیمی جیهان ناوبردووە ١٦ ساڵ فەرمانڕەوای کردووە. بەناوبانگترین پاشای کاسیەکان لە بابل دا « اگوم کاک ریم » بووە. وە لە ساڵی ١١٧١ پ.ز ئەم دەوڵەتە گەورەیە رووخا، لە لایەن ئیلامەوە. بەسەرۆکایەتی پاشای ناسراوی ئیلام کوتیرناخوشە ناوبراو پاش ئەوەی بابلی گرت، لە شاری سیپار ستونی سەرکەوتنی نارامسینی بردە ئیلام ئەو سەرکەوتنەی نارامسین بە سەر لولویەکاندا لە فەرەداغ.وە ئەو بەردە گەورەی کە قانوونی حامۆرابی لەسەر نووسرا بوو بردیە شوش، بە فەرمانی ئەو هێندێک لەو نووسینەی حامۆرابی کوژاندەوە، بۆ ئەوەی بەناوی خۆیەوە هەندێکی بنووسێت، ئەمەش سەری نەگرت بۆی، پاش نەمانی دەوڵەتەکەیان گەڕانەوە بۆ جێگای خۆیان لورستان.

**ئاشوریەکان:**

لە ناوەڕاستی ٣ هەزار ساڵەی پ.ز هاتونەتە ناوچەی باکوری عێراقەوە، هاوچەرخی سوبارتیەکان بوون، ئاشور لە رەگەزی سامین، وە لە جزیرەی عەرەبیەوە کۆچیان کردووە، زمانیان زمانی ئەکەدی بووە و نووسینی میخییان بەکار هێناوە، کە نووسین و دۆزینەوە سۆمەریەکان بووە، ئاشور یەکەم شارو یەکەم پایتەختی ئاشوریەکان بووە کە بەو ناوەوە ناونراوە. ئاشوریەکان لە ئاسیا سەروو پێنج سەد ساڵ فەرمانڕەوایان

کردووه، یەکەم گەلێک کە سەرپێچیان لێکردوون مادەکان بوون، لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆی خۆیاندا بەردەوام شەڕیان لەگەڵدا کردوون، خەڵکێکی کەش چاویان لە مادەکان کردووە بەشەر هاتوون لەگەڵ ئاشوریەکاندا. ئاشوریەکان لە هەموو ماوەی فەرمانڕەوایاندا، کەلە نووسینەکانی مەلیکەکانیاندا هاتووە بە شێوەی نووسینی میخی، زۆر شانازی بە سوتاندنی دێهات و تێکدان و کاولکردن و کوشتن بە شێوەی ناسۆر و ئەشکەنجە و جۆرا و جۆر و بە دیل بردنی خەڵکێکی زۆر لە ژن و لە پیاوەکەن، پیاوەکان بە ڕووت و قوتی و لە دواوە هەردوو دەستیان بەستوون، ژنەکان داوێنیان بڕیون و لەگەڵ پیاوەکاندا ئەو هەموو ماوە دوورە بەو شێوەیە بردونیان بۆ نەینەوا.

بەکۆمەڵ منداڵ سوتاندنی مادەکان، پەلجە بڕینی دانیشتوان کە مەترسیان لێکردوون شەڕیان لەگەڵدا بکەن. گوێزانەوەی فراوان و دوورخستنەوەیان و هێنانی ڕەگەزی کە بۆ جێگاکانیان. ئەمانەی باسکرا لە دوای ئەم لاپەڕانەوە دێت. ئەم هەموو شەڕ و هەرایە، بەپێی نووسینی هیرودت کە ۱۰۰ ساڵی خایاندووە لە ۱۲۷٤-۷٥٤پ.ز لە نێوان ئاشور و مادەکان دا بووە، پاش ئەو مێژووەش بەردەوام شەڕوو هەرا بووە تا ساڵی ٦١٢پ.ز. میتانی: فەرمانڕەوا بوون بەسەر ئاشوریەکاندا، پاشان میتانی بونەتە دوو بەش یەکەمیان لە ناوچەی گۆمی وان، دووەمیان لەسەروو وڵاتی ئاشورر و بەشێکی سوریا، پاشان میتانیەکان وڵاتەکەیان تەسک بۆتەوە، تا بوونەتە وڵاتێکی بچووک، لە بەرزاییەکانی سەرووی نێوان دوو ڕووبار، لە نووسینی میخیەکاندا ناوی « خاتی گورلباتی » هاتووە، لە دوایدا کە بێ هێز بوون، ئاشووریەکان ئەوانیان خستە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە، ئەم ڕووداوانەش ئەبێت لە ساڵانی ۱۳٦٥-۱۳۳۰ پ.ز لەکاتی فەرمانڕەوای مەلیکی ئاشور، ئاشور ئوبالت دا بوو بێت، لەم کاتانەدا

پەیمانێک بەسترا لە نێوان ئاشور و کاشیەکاندا، کچی ئاشور ئوبالت درا بە کوڕی پاشای کاشیەکان.

شەلمان سەری یەکەم لە ١٢٧٤-١٢٤٥ پ.ز پەلاماری ئورارتو « ئەرمینیا » و ناوچە شاخاویەکانیدا، ولاتی خاتی گلباتی میتانی خستە سەر ولاتی ئاشور. شاری کلخو « نەمرود »ی دروستکرد و کردیە پایتەختی خۆی، لەم هێرشەدا تالانێکی زۆر، کوشتن، کاولکردن و دیلێکی زۆری هێنا بۆ ئاشوور، توکلتی ئنورتای یەکەم ١٢٤٤-١٢٠٨ پ.ز ئەمیش هەروەک باوکی پەلاماری ناوچەکانی زاگرۆس ئەداو بەو کردەوانە هەڵ ئەسا. ناوبراو یەکەم پاشایە کەوتە گوێزانەوەی دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکان، بە تایبەتی ئەوانەی ملیان نە ئەدا و شۆرشیان لە دژ ئەکردن، ئەم ڕاگوێزانەش بۆ جێگا دوورەکان بوو، ئەم ڕەوشتە بوو بە پیشەی هەموو پاشاکانی ئاشور ئەوانەی بە دوای ئەودا هاتن و بەردەوام لەسەری رۆیشتن.سەلمان سەری یەکەم لە نووسینێکی میخیدا کە دۆزراوەتەوە، باسی ئەم تیرانە ئەکات کە ئەوەش بەڵگە نامەیە ئەڵێت:

خالدی و ئاراراتی، سوباری و نایری و میتانی و موشکی و زۆری کە هەموو گوتی بوون، قەومی گوتی کە لە ئاسمانی ئەم سەدەیەدا وەک ئەستێرە ئەدراوشانەوە لەبەر زۆریان، وە زۆر بە توانا و بەهێز و ئازایەتی و شەرکەریان ناوبانگیان هەبوو، بەرامبەر بە من یاخی بوون و دوژمنایەتی منیان کرد پاش شەڕکردن لەگەڵیاندا، لە سنووری ئەراراتەوە تا، کە موخی « تەور عابدین » و بەرینای ئەم ولاتە گەورەیە خوێنی گوتیەکانم وەک ئاو ڕژاند.

ئەمەش نیشانەیە بۆ ئەوەی کە هەموو ناوچەی زاگرۆس نیشتمانی قەومی گوتی بووە. هەر لە سەدەی ٩ پ.ز ئاشوریەکان دەستیان کردووە بە لەشکر ناردن بۆ سەر ناوچەکانی « ماد » وەک جارانی پێشوو ئەمجارە بە

ئاشوریەکان دیلەکان ئەکوژن ـ لەروی نەخشی دەروازەی (بالاوات) ی
سالمانا سارى سێیەم گیراوە ٠٠ لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا ٠٠

دەستوبرد تر. بەمەبەستی تالان کردن و کوشتن و دیل هێنان.

هێرشی ئاشور کە دەستی پێ ئەکرد بۆ سەر ناوچەکانی ماد، دانیشتوانی ئەو ناوچانە بە زۆری ئاگریان لەسەر لوتکەی شاخەکان ئەکردەوە، نیشانەی ئەوە بوو کە لەشکری ئاشور هاتووە. خەڵکەکەش بە ناچاری ئاژەڵەکانیان ئەبردە سەر لوتکەی شاخەکان و، ئەو دیهاتانەی شورایان هەبوو ناچار بەرەنگاری ئاشوریەکان ئەوەستان و بەشەر ئەهاتن، شوراکان بەهێز ئەبوون و ئەگیران و بە ئازار و ئەشکەنجە ئەکوژران.

لە کۆتای سەدەی دەهەمی پ.ز «ئاداد نیراری» پاشای ئاشور لە ٩١١ - ٨٩٠ پ.ز ناوچەی ئەویەری زێی بچووک، سنووری کیشوەری لولوییەکان لە « هابهی » و زامواتا گەردنەکانی کیشوەری ئاماری گرت، پێشتر بەرەو سەرچاوەی زێی گەورە تا کیشوەری « میهری » نزیک کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ئورمی چوو بوو، تۆکۆلتی ئینورتی دووەم، لە ساڵی ٨٨٥ پ.ز کەوتە داگیرکردن، دێهات سوتاندن، تالان و بە دیل هێنانی خەڵکی.

ئاشور ناسرپالی دووەم، لە ٨٨٣ و ٨٨١ و ٨٨٠ پ.ز کەوتە لەشکر بردن و دەستدرێژی لە جارانی کە زۆر تر و زیاتردرندانەتر. لە ساڵی ٨٨٣ پ.ز پاشای ئاشور لە رێگای « کیرەوردی »وە چووە ناوچەی زێی گەورە و بەرەو رۆژئاوا رۆیشت و هەموو جێگایانی کیرووری و سەیس و سەیرە و خاگاو... هتد داگیرکرد. خەرج و باجێکی زۆری خستە سەر دانیشتوان، ئەم جێگایانەش لە کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ئورمی وە بوون. لولوییەکان ئەم لەشکر هێنانەی ئاشوریان باش لێکدا بووەوە ئەیانزانی ئەمە یەکەم هێرشی ئاشور نیە، بۆیە کەوتنە خۆیان لە ساڵی ٨٨١پ.ز بە هەموو توانایانەوە بۆ بەرەنگاری ئاشوریەکان کەوتنە خۆ ئامادەکردن، پێشەوای هۆزی « ناسیگو » بەشی دەرگا کە بە زمانی ئەکەدی پێیان ئەوەوت « نور

بردنی دیلەکان ـ لە روی نەخشی دەروازەی (بالاوات) ی
سالمانەساری سێیەم گیراوە ـ لە سەدەی نۆیەمی پێش زاینی دا ..

ـ ناداد » بوو بە سەرکردەیان، هەموو خەڵکی سەرانسەری وڵاتی زاموآتی لە دەوری خۆی کۆکردەوە، لەشکرەکەی وەک شورا لێکرد. ناسیرپاڵ ئیمپراتۆری ئاشور نەیهێشت نورآداد کاری خۆی بەجێ بهێنێ، بە پەلە بەهێزیەکی فراوانەوە پەلاماریدا پاش شەڕێکی خوێناوی هەمووی داگیرکرد، پایتەختی « بازیانی » ئیستا و ۲۰ شارەکەی گرت. نورآداد هەڵهات بۆ شاخی نەیسر، کە پێشتر لولوبیەکان پێیان ئەوت کینبا « پیرەمەگرون »ی ئیستا، نەیسر بە زمانی سۆمەری واتە رزگاری بەپێی باس و نووسینی بابلی کەشتیەکەی نوح لەوێ نیشتۆتەوە. ناسیراپاڵ سێ پاشای بچووکی زاموای گرت، بۆ چاوترساندن لەسەر چەقی رێگاکاندا لەت و پەتی کردن، تالآنی « داگار » وە پادشای « موساسینا » کە ناوەندی ئەو لە قەڵای « لاریوسا » بوو هەمووی تالآنکرد. پاشان ئەمیرەکانی‌کەی زاموا ملیان بۆ کەچ کردو خەرج و باجێکی زۆری خستە سەریان و وڵاتەکەیانی بە ئاشورەوە بەستەوە، لە نیوەی سەدەی نۆهەمی پ.ز لەو کاتەوە ناونرا « زاموا » یان مازاموا، لەلایەن ئاشوریەکانەوە، بەشی زۆری ئەم وڵاتە ماننایان پێ ئەووت. پاش چەند ساڵێک دوو میر نشینی زەموای خوارو « ئامکام » و « ناراشتوا » خەرج و باجیان نەدا، دیسان ئاشور ناسیرپاڵ بە لەشکرەوە پەلاماری دان قەڵای « ئامالی » و قەڵای « ناراشتوا »ی داگیر کرد کەوتە تالآن و کوشتار لە نێو بنەماڵەی پادشاکانی ناراشتوا ، هەروەها میرنشینەکانی دەوروبەری « کیرتیارا/ش کە » باربار نیوەندیان بوو، هەروەها سابینا/ش نیوەندی خودون و موساسینا کە نیوەندی بوناس/ی بوو تا گەردەنەکانی « خاشمیار ». لەناو هەموو ئەمانەدا تەنها داگارا بەڵێنی دا خەرج و باجیان بداتێ لە شوێنەکانی کەدا شوێنەواری ناوچەکەی سڕیەوە، هەرچی لاو ئەوەی بەکەڵکی ئیش ئەهات بەدیلی گرتنی، هەرچی منداڵ بوو ئاگرێکی گەورەیان

کردەوە و هەموویانی فڕێدانە ناو ئاگرەکەوە، سوتاندنی، پاشان ئاشوریەکان بەرەو ئەمارەتی « ئامکا » کشان ئەو ناوچەیە لەترسا خۆیان شاردەوە لە کێوەکاندا، ئاشوریەکان لە قەڵای « زارو » وە ئاوابیەکانی دەوروبەری کە چۆڵ و وێران کرا بوون، هەرچی هەبور هەموویان تالانکرد، ئەوانەی بەدیل گیرا بوون لە شەرکەرەکان بە جۆرەها شیوازی ئازار و ئەشکەنجەدان ئەیان کوشتن. دوای ئەوە پەلاماری پادشایەک کە ناوی « ئاتا » بور کەوتبووە دامێنی زۆری کێوەکانی « نیش پور » داگیر کەوتبووە خواریەوە، ئەم شانشینەشیان هەروەک میر نشینەکانی تر تەفروتونا کرد و کاولیان کرد. ئاشووریەکان پیشەکەرانی « زاموا »یان بە بێگار بردە شاری کلحو، پاشایانی گلیزان و « خۆبوشکیە » لە خواروی دەریاچەی وان و قەڵای کاسی « خارتیش » ئەوانیش هەریەکە دەستە دیاری خۆیان نارد بۆ پادشای ئاشور، ئاشور ناسیناپاڵ بەمانە رازی نەبوو جارێکی تر هەوڵی دا کە خەڵکی زاموا ئەوانەی کەلە چیاکاندا خۆیان شاردبۆوە دەستگیر بکات، قەڵای « ئاتلیل »ی کە ماوەیەک بەدەست پادشاکانی کاسیەوە بور نوێی کردەوە، کردی بە ناوەندی کۆکردنەوەی دارایی و باج و خەراجی ویلایەتە دامەزراوە گیراوەکان، پاش داگیرکردنی ئەو ناوچانە ئاشوریەکان هەندێک لە دەست و پێوەندەکانی خۆیان کردە چاودێری بەسەریانەوە، ئوردوگایەکی لەو ناوەدا دروستکرد بۆ کۆکردنەوەی باج، زۆری نەخایاند کە ئەو ناوچانە دژی ئاشوریەکان راپەڕین و هەر هەموویان سەربەخۆی خۆیان وەرگرتەوە.

لەساڵی ۱۸۵۹ پ.ز سەڵمانسەری سێیەم بە لەشکرەوە هاتەوە سەر ئەو ناوچانە ئاشوریەکان دەستیان نەگەشتە شوێنە دوورەکان بۆیە لە زاموا جێگەیەکیان وەک ئوردوگا دروستکرد، لەوێوە کەوتنە پەلاماردانی جێگا دوورەکان بۆ کوشتن و تالان و سوتاندن، دوای قەڵاچۆکردنی میرنشینە بچوکەکانی دەوری زاموا لە سەردەمی گرنگترین پادشای زاموا دەوڵەتێک

له زاموای ناوخۆ هەبوو « نیک دیارا »یان « مەکتیبارا » سەرۆکایەتی نەکرد لە ساڵی ٨٥٥ پ.ز سەلمانسەری سێهەم پەلاماری داوە سەرکەوتوو نەبوو.

بە شێوەیەکی گشتی لە سێ چارەکی یەکەمی سەدەی نۆهەمی پ.ز لە ناوچەی ورمێ و رووباری « چەختۆ » بێ گیروگرفتی گەورە چەند دەوڵەتێک دامەزرا لە ساڵی ٨٢٤ پ.ز سەلمانسەری سێهەم شۆرشی ناوچەی ناماری کوژاندەوە وە « یانزی » پێشەوای بێت هامانی دراوسێی ناوچەکە کردیە پادشا. پاش ماوەیەک سەرپێچی کرد. ئاشوریەکان لەشکریان لای ژوری رۆژهەلات و لە رێگای چیاکانی خاشمار خاشیمۆر بۆسەر نامار نارد، هەموو قەلاکانی نامایان ویرانکرد هەرچی شتومەک لە شاخەکاندا شاردرابۆوە هەموویان برد. یانزی پادشای نامار رای کرد بووە ولاتی مادەوە، ئەمەش بیانویەک بوو ئاشوریەکان پەلاماری خاکی ماد بدەن، چوونە سەر خاکی « مسی » لە بەشی ژووروی رووباری « چەختۆ » لەونوە بەرەو ناوچەی « ئارازیاش » وە « خارخار » کە لەو کاتانەدا بەشێک بوو لە یەکێتی هۆزەکانی ماد.

سەرچاوە ئاشوریەکان بۆیەکەم جار ئەم سەرزەمینە بە ئامادا ناو دەبەن. ساڵنامەکانی سەلمانسەری سێهەم باسی چوارقەلا دەکات کە لە خاکی مادا بەکاری هێناون، ئاشوریەکان تالانێکی زوریان لە خاکی ماد دا کردووە، وە یانزی پادشای ناماریشیان بە دیلی لەگەڵ خۆیاندا برد. لە ساڵی ٨٢٨ پ.ز سەلمانسەری سێهەم پیر بوو بۆیە لەشکرێکی بەسەرۆکایەتی تۆرتان پێیان دەووت « دایان ئاشور » رۆویان کردە زاموای ناوخۆ لە دەراوی زێی گەورە بەرەو «خۆبوشکیە » لە خوارووی دەریاچەی وان وە لە وێوە بۆسەرزەمینی ئۆئالکی پاشای مانئا. ئۆئالکی هەڵهات بۆ شاخەکان قەلای ئیزیرتو یان زیرتو کە زۆر سەخت بوو پاش شەرێکی خوێناوی داگیریان

کردوو هەرچی مەڕو ماڵات هەبوو هەموویان بە تالآن برد. دیسان لە ساڵی ۸۳۷ پ.ز ئاشوریەکان پەلاماریان دایەوە پاش کوشتن و سوتاندنو تالآنێکی زۆر وە دیلێکی زۆریان برد، هەر لەم ساڵانەدا لە زاموای ناوخۆ تێپەڕین و بەرەو نامار سەرەو ژێر بوونەوە قەلآی بۆشتۆ لە سنووری ماننا چەند شوێن و قەلآیەکی تری مانناییان داگیر کردوو « نامار » یان لە ناو برد و ناوچەکەیان کرد بە گۆمی خوێن لە ساڵانی ۸۲۷-۸۳٤پ.ز دیسان هێرشیان کردۆتەوە سەر ناوچەکان و هەر وەک جارانی پێشوو کردەوەی نارەوایان کردووە.

شامشی ئادادی پێنجەم، پاشای ئاشور لە ساڵی ۸۲۱پ.ز دەستی کردووە بە هێرش کردن بۆسەر خاکی ماد وەلە ساڵی ۸۲۰ لەشکرێکی بەهێزیان کردە سەر مادەکان بە ناو مانادا تێپەڕین و گەشتنە خاکی ماد لە بەشی ژووروی چەختۆ دەستیان گرت بەسەر ژمارەیەکی زۆر لە مەڕو ماڵات، گەلێک ئاواییان سوتاندو زیانێکی زۆر لە « مسی »یەکان کەوت وە ناوچەکانی دەوروبەری ورمیێ کوێستانی « گیزیل بوندا »یان داگیر کرد. شەش هەزار شەرکەریان لێ کوشتن و ۱۲۰۰ کەسیشیان بە دیل گرت و هەرچی هەبوو تالآنیان کردو ئەو ناوەیان کردە گۆمی خوێن. پەلاماری هۆزێکی مادیان دا پاشاکەیان بە ناوی « هانا سیرۆکا » لە قەلآی « ساگ بیتۆ »دانەنیشت لەعانیش ۲۳۰۰ کەسیان لێ کوشتن و ۱۲۰۰ دیکەیان لێ بەدیل گرتن وە قەلآی ساگبیتۆ ئەو ناوچەیە وێران کراوو ۱٤۰ سواریان لێ بە دیل گرت مادەکان بەمە تێک نەشکان. مونو سوارتا، کە فەرمانڕەوای ئارزیاش بوو کە هۆزێکی مادە، لە کاتی تێپەڕ بوونی ئاشوریەکان بە کێوەکاندا رێگای لێگرتن و بەشەرهات لەگەڵیاندا، مادەکان زیانێکی زۆریان لێکەوت بە ۱۰۷۰ کوژراو، وە بەشێکی زۆریشیان لێ بەدیل گیراوە زۆریش لە ئاشوریەکان کوژران.

ئاشوریەکان بە زۆر کۆچ بە خەلکی ئەو ناوچانە ئەکەن کە کەوتونەتە ژێر
دەستیانەوە لەروی نەخشێکی هەلکەندراو لە نەینەوا گیراوە ـ سەدەی حەوتەمی
پێش زاینی

شەمشی ئاداتی پێنجەم پاشای ئاشور لە سالی ۸۱۰ پ.ز مردووە پاش خۆی کورەکەی هاتە جێگای هەرچەندە مندالْ بوو، بەناوی ئاداد نیراری سێهەم، بەهۆی مندالێیەوە شاژن « سامورامات » کە لەمێژوودا بە سەمیرامید « سەمیرامیس » بەناوبانگە، ولاتەکەی بەرێوە ئەبرد، ئەفسانە لەسەر ئەو ژنە هەیە، پاش ٥ سالْ لە ۸۰٥ پ.ز ئادادنیراری فەرمانرەوای ئاشوری گرتە دەست، هەر چەند سەمیزمیس هەروەک جاران فەرمانرەوای دەکرد، چەند جارێک لەشکریان کردۆتە سەر مادەکان و مانا، لە سالەکانی ۸۰۹، ۸۰۷ پ.ز لە دژی مانا وە دیسان لە ۸۰٦ پ.ز لە سالەکانی ۸۰۰، ۷۹۹، ۷۹۷ لە دژی ماد و، وەجارێکی کە لە سالی ۷۹۳، ۷۹۲، ۷۸۸ پ.ز ئەو هەموو سالانە شەریان لەگەلْ مادەکان کردووە، لە سالی ۸۰۲ لە نووسراوێکی سەمیرامیس و ئادادنیراری دا هاتووە کە ئاشوریەکان لە « ئیللیپی » نزیک ئارازیاش وە کیشوەری مادەکان و سەراسەری گیزیل بوندار « مانا » وە « ئاللابریا » فەرمانرەواییان کردووە لە نووسراوی سالی ۸۰۲ پ.ز باسی کیشوەری ماد « مادای » کراوە. دوای ئەو مێژووە سەمیرامیس و ئادادنیراری پێنج جاری دیکە لەشکریان کردۆتە سەر خاکی ماد وە شەریان لەگەلْ کردووە. پەلاماری « مینوا » پاشای ئورارتو لە سالی ۸۰۷ و ۸۰٦ پ.ز پێنج جار لەخواررووی دەریاچەی وان لە « خۆبۆشکیە » سالانی ۸۰۱ و ۷۹۸وە ۷۹۱ وە ۷۸٥ و ۷۸٤ پ.ز کەوتوونەتە شەرەوە.

سەلتانـاری چوارەم جێنشینی ئادادنیراری سێهەم، دیسان لە سالی ۷۸۱-۷۷۸ پ.ز لەگەلْ ئورارتۆدا لە جەنگدا بوون. ئورارتو « موساسیر » لە بەشی ژووری زێی گەورەدا گرتبوو وە هەرەشەیان لە ئاشوریەکان دەکرد لە سەرەتای سەدەی هەشتەمدا چوونە بەشی ژووری ناوچەی فوارت. لە سالانی ۷۷٥ وە ۷۷٤ وە ۷۷۲ پ.ز بەشەر هاتوون وەهەموو

بەزۆر کۆچاندنی مادەکان ، لەروی بەردێکی ئاشوریەکان لە نەینەوا کێشراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زاینی ]

جارێک لەشکری ئاشور هاتونەتە سەریان. هەر لەم ساڵانەدا ماننا لە ئورارتۆ جیابوونەوە.

تیگلات پلایسەری سێهەم لە ساڵی ٧٤٣ پ.ز پەلاماری ماننای دا هەرچەند ماننایییەکان لە ڕووی هێزو پایەخەوە لە ئاشور و ئورارتۆ کەمتر نەبوون، ئاشورییەکان بە کیشوەری ماننایان دەوەت « مادمانننانی » کۆمەڵێک لە پیاوە گەورەکانی ماننا هەبوون پێیان دەوەتن ئەنجومەنی پیاوە گەورەکان. وڵاتەکەیان بەڕێوە دەبرد، پاشان دەوڵەت پەیدا بوو لە ساڵی ٧٨٨ پ.ز مانناییییەکان لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی خۆیاندا لە بەرامبەر لەشکری ئاشورییەکاندا وەستان. دوا لەشکر کێشی سەمیرامیس و ئادادنیراری بۆسەر خاکی ماد تا ساڵی ٧٤٥ پ.ز خاباند وە دوا هێرشیان لە ساڵی ٧٤٤- ٦٧٨ پ.ز بووە.

لە ساڵی  ٧٤٤ لەشکری ئاشور ڕوویان کردە بەشی ژووروی ڕووباری سیروان، چونە سەر خاکی زاموای خواروو ئەو ناوچانە « بێت کاپسی » بێت سانگی یان بێت ساگی و  بێت نزگی. ئاشورییەکان دیهاتەکانیان دەسوتاند و تالانیان دەکرد لە فەرمانبەرەکان ئەوانەی دەستگیر کران « کاکی باشای بێت زانی » وە « میتاکی پاشای بێت سانگی » ئەمانە زۆر بە ئازارو ئەشکەنجەوە دەیان کوشتن. هەندێک لە شەرکەرەکان کە بەشداریان کردبوو لە شەڕ دا خۆیان دایە دەست ئاشورییەکان پەنجەیان دەبڕین بۆ ئەوەی جارێکی تر شەڕ نەکەن لەگەڵیاندا.

توونی فەرمانڕەوای « سومزرزۆ » کەوتبوە دەراوێکی لەقەکانی خوارووی ڕۆژهەڵاتی سیروانەوە، پاش شەڕێکی خوێناوی لەگەڵ ئاشورییەکاندا زۆری لێ کوژرا و زۆری لێ بە دیل گیرا هەروەها سۆمزن زۆ وە بێت هەمان لە دەراوی سیرواندا بوون داگیر کران لە لایەن ئاشوورییەکانەوە لە ساڵی ٧٤٤ پ.ز تیگلد پلایسەری چوارەم لە ئەنجامی

شەڕکردن لەگەڵ مادەکاندا ٦٠ .هەزار دیلی هێناوە بۆ وڵاتەکەی خۆی لەگەڵ تالانٰدا. دیسان تیگلدپلایسەر لە شەڕەکانی دوایدا ٦٥هەزار کەسی لە ناوچەی مادەوە هێناوە بە زۆر کۆچی پێکردوون و لە دەراوی سیرواندا نیشتەجێی کردوون وە لە جێی ئەوان ئارامی بردۆتە جێگای ئەوان.

لە فەرمانڕەوای سەرجوونی دوهەمی ئاشووردا شاری « ساماری » لە فەلەستین داگیر کرا بە قسەی تورات هەندێک لە بەنی ئیسرائیل بەدیل گیرا بوون و لە شاری کالح ــ کالاوە خابوور لە رووباری جۆزان و شارەکانی ماد دا بلاوکراونەتەوە. لە ٧١٦ پ.زئاشوورییەکان لەشکریان کردۆتە سەر ماد لە ئەنجامدا خاکی ماد و ماننا کە نزیک بە دەریاچەی ئورمێ بوون کەوتە بەر تالان و کوشتن و سوتان لە لایەن ئاشوورییەکانەوە ئەمەش لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سارگۆنی دووەمدا بووە.

لە سەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی ماد و سەردەمی هاتنی دیاکۆ ناکۆکی و جیاوازی زۆر هەیە بەلام زۆربەیان ٧٠٠ . پ.ز ئەگێڕنەوە، چونکە لە ساڵی ٧١٥ پ.ز دیاکۆ گیراوە، دوورخراوەتە بۆ سوریا، لەوێ بەهۆی ماننایەکان کە لە تیرەی خۆیان بووە هەڵهاتووە و گەیشتۆتەوە ناوچەی خۆی.

دیوک شەڕی کردووە لەگەڵ ئاشوردا تێک شکاوە

سنحاریب، سنخاریب، جێنشینی سارگون لە ساڵی ٧٠٢پ.ز بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو خۆرهەلات کشاوە بە ئیلاما تێپەڕیوە، لە جێگا دوورەکانی خاکی مادەوە پەڕیوەتەوە. سنحاریب ئەڵێت باجێکی زۆرم وەرگرت لە دانیشتوە دوورەکانی ماد ئەو تیرەی شەڕیان لەگەڵدا کردووە ناویان کاششیان ــ کاسیان بووە.

زاموا « ژووری سولێمانی ئێستا » وە پارسوا ژووری ناوچەی سیروان کە ناوەندەکەی قەلای نیکور بوو مادای یان ماد « رەنگ بێت لە

خوارووی کینشەسور لە دەشتی قزل ئوزون » ساپاردا کە لەوەوە بەرد بەستێک بووە لە ناوچەی خارخار رەنگ بێت لە خوارووی خەتی زنجان و تەوزوینەوە بوو بێت، نارایخا، کەرکوکی ئیستا بەشێکیش لە ناوچەی پێشووی نامارروو، تا ناوچەی خوارووی رۆژهەلاتی دەراوی سیروان نەگرتەوە وە بە پیت هامبان « لە رۆژئاوای کرماشانی ئیستاوە بوو بێت » بەمجۆرە بەپێی ناوچەکانی زاموا و پارسواو آرایخا، ئاشوریەکان لەو ناوچانەدا بەهێز بوون، بەشێک لەم ناوچانە لە دەرەوەی سنووری مادا » بوون، دەستەلاتی ئاشوور لە ناوچەکانی تری ماد دا تا رادەیەک بێ هێز بوو. لە ژانوینی سالی ٦٨٠پ.ز سنحاریب پاشای ئاشور بە دەستی یەکێک لە کورەکانی خۆی کوژرا، دوان لە کورەکانی رشایان کرد بۆ ناوچەی « سوبری » لە رۆژئاوای دەشتەکانی ئەرمەنستان، لە کۆتایی ئەو سالەدا برای سێیەمیان بە ناوی « ئاساخادون » بووە پاشای ئاشور. لە سالی ٦٧٩ پ.ز کمیریەکان کەوتنە هێرش کردن بۆ سنووری ئاشور، شەر بەردەوام بوو سالی یەکەم و دووەم. پاش ئەو هەموو شەرئوو کوشتارە کیمریەکان لەگەل ئاشوریەکاندا ئاشت بوونەوە کە لە ٦٧٩- ٦٧٢ی خاباندووە. ئاشوریەکان وەک لەسەرەتاوە وتمان زۆر بە توندی و درندانە دژی مادەکان شەریان ئەکرد، سەرکردە دیلەکانیان بە ئازار و ئەشکەنجەدان ئەکوشت و کەولیان ئەکردن بە زیندوویی. دیلەکانیان بە رشووتی و دەستیان لە پشتەوە ئەبەستنەوە تا ئەیان گەیاندنە پایتەختەکەیان ئەیبنەوا، ژنە دیلەکانی ناوچەی مادیان ئەدایە پێش و داوێنیان ئەدرین، هەرچی لاویوایە و لە کوشتن رزگاری بووایە بە دیلی ئەیانبرد و ئەیان کردنە بەند. مندالەکانی ناوچەی مادیان ئەستووناد لە ناگردا بە بەرچاوی خەلکەوە بۆ چاوترساندنی مادەکان. پەلجەی شەرکەرەکانیان ئەبری، تالان و سوتاندن و کۆچ کردنی بە زۆر پیشەیان بووە. ئەم شتانە و وێنانە هەمووی لە وێنەو

چەرمەسەرە دانی پێشەوا گیراوەکان ، کە بەربەرچی ئاشوریەکانیان دابووە ، لە ئەینەوا نەخش کراوە [ سەدەی حەوتەمی پێش زایینی ] ..

نووسینی میخییەکانی ئاشوریدا نووسراوە، لە هەمان نووسیندا هەندێک لەو وێنانە ئەخەینە ڕوو.

## ماد ــ مادای

لەساڵی ٦٧٢ پ.ز دا ئەسکیتیەکان لە مادی ئاوندیا پەیدا بوون، پشتگیریان لە مادەکان کرد، دژی ئاشوریەکان. مانناییەکان لەگەڵ ئەسکیتیەکاندا هاوپەیمان بوون. چەند سەرچاوەیەکیش ئەڵێن ه ئیلامیەکان ه ئامادە بوون یارمەتی ڕاپەڕینەکانی ماد بدەن، لەم ڕووەوە هەموو هۆزەکان بوونە یەک و لەیەک بەرەدا یەکیان گرت، لە ڕووی دەستەڵاتی ئاشوریەکاندا وەستان، لە نەوروزی ساڵی ٦٧٣پ.ز دا مادەکان لە دژی ئاشوریەکان ڕاپەڕینو ٣ پێشەوای ٣ جیگا بوونە یەک، مادەکان کەوتنە پەلامار و گرتنی ئەو قەلابانەی کە بەدەست ئاشوریەکانەوە بوو، لە سەرەتای مانگی ئایار، ناوەراستی ئەپریل ساڵی ٦٧٣ پ.ز خەڵکی ئەو سەر زەمینە فراوانە هەموی یاخی بوون و شۆرشگێرەکان دەستیان کردە پەلامار دان و هەرەشەیان لە قەلاکانی ئاشوریەکان ئەکرد و پەلاماریان ئەدان. لەسەرەتای مارسی ٦٧٢ پ.ز ئاشوریەکان ناچار بوون، کە چەند نمایندەیەک بنێرنە لای پێشەوای شۆشگێرەکان، ئاشوریەکان زۆر هەوڵیاندا دوو بەرەکی بخەنە نێوان شۆرشگێرەکانەوە، بەو مەبەستە بە جیا قسەیان لەگەڵدا ئەکردن، مادەکان لە پەلامار نەوەستان و قەلاکانی ئاشوریان ئەگرت.

## ماد:

یەکەمین پاشای ماد کە شاری ئەکباتانی دروست کرد و سەڵتەنەتی مادی دامەزراند دیوک بووە، ٥٣ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد، دوای ئەو فرائۆرتی کوری، کە فارسەکان و هۆزەکانی تری ئاسیای خستە ژێر

فەرمانڕەوای خۆیەوە ٢٢ ساڵ فەرمانڕەوای کردووە، زۆر دژی ئاشوریەکان بووە، شەڕی لەگەڵدا کردوون، فرائورت لە شەڕی ئاشوریەکاندا لەناو چوو. کیاکساری کوڕی، لەشکری مادی ڕێک خست . ٤ ساڵ فەرمانڕەوای کرد. « ئەسکیتیەکان » ماوەی ٢٨ ساڵ دەسەلاتدار بوون بەسەر ئاسیادا. پاشان کیاکسار ئەوانی خستە ژێر دەستەلاتی خۆیەوە، پاش مردنی کیاکسار، ئاستیاگی کوڕی چووە سەرتەخت و ٣٥ ساڵ فەرمانی کرد. بەم شێوەیە ٥٣+٢٢+٤+٣٥= ١٥٠ ساڵ فەرمانڕەوا بوون، هەرچەند ناکۆکی زۆرە لەسەر ئەم مێژوانە، بەتایبەتی ئەو ماوەیەی کە ئەسکیتیەکان فەرمانڕەوا بوون ٢٨ ساڵێک نەکات. لە ساڵی ٧٠٠-٥٥٠ پ.ز مادەکان فەرمانڕەوا بوون « دیوک = مامی تیارشو » لە نووسینەکانی هیرۆدۆت وا هاتووە، بەیەک کەسی دا ئەنێت، دیوک، دیائوکو، دیاکۆ/ی پێ وتراوە.

لە کۆتایی ساڵی ٦٥٢-٦٥٣ پ.ز ئەمپراتۆریەتی ئاشور دووچاری مەترسی ترین گێژاوی سیاسی خۆی بوو، هۆکەشی ڕاپەڕینی « شاماشیموکین »ی برای ئاشور پانیپال، کە لە لایەن ئاشورەوە کرابوو بە پاشای بابل، میسر لە ئاشور جیا بوەوە، ئەم جێگایانەش بە قسەی براکەی هەڵگەڕابوونەوە، لە ئاشور، خەڵکی ئەکەد، کلدان، ئارامی، خەڵکی کەناری دەریا، لە ئاکابا تاکو باب ساڵی مەتی، دەستو پێوەندی « ئومانیکا شای ڕاکردوو فەرمانڕەوای ئیلامی ئەکرد، هەروەها پاشایانی گوتیوم و ئامۆرزو، ملوخا، ئەمانە هەموو لە لایەن شامو شکینەوە هاندرا بوون ئامۆرزو ملوخا بە زمانی ئاشوری واتە پانای گەورە ئەگرێتەوە بە مانای بەشەکانی جیهان. ملوخا بەواتە ئەفریقا، ئامۆرو بە واتە سوریە و فینیقیە و فەلەستین، « فینیقیا لوبنانی ئێستا » گوتیوم گوتیەکان مادەکان.

لەم سەردەمەدا ماوەی ٢٢ ساڵ بوو کشتریتی یان خشتریتا یان بە

وتەی هیرودوت « فرائورت » فەرمانڕەوای ئەکرد، لە ئاسیادا دەستی کرد بە داگیرکردنی هۆز بە دوای هۆزداو ئەی هێنایە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، چووە سەر ئاشور و لە شەڕدا کوژرا و زۆربەی لەشکرەکەشی تیاچوو، فرئورت لە ساڵی ٦٧٣ پ.ز دا سەرەتای فەرمانڕەوایبووە. پاش ئەو کوڕەکەی بە ناوی کیاکسار بووە فەرمانڕەوای ماد، ئەمیش دژی ئاشوریەکان درێژەی بەشەڕدا، ئەسکیتەکان یارمەتی مادەکانیاندا، دژی ئاشور، لە لایەن « مادیا » کوڕی پروتوتی پاشای ئەسکیتەکانەوە بوو هەرچەند ئەسکیتەکان ٢٨ ساڵ فەرمانڕەوای مادیان کردووە، لە ساڵی ٦٥٣- ٦٢٥ پ.ز.

کیاکسار فەرمانڕەوای ماد بووە لە ساڵی ٦٢٥-٥٨٥ پ.ز ماوەی ٤٠ ساڵ فەرمانڕەوای کردووە. لە ساڵی ٦٤٨ پ.ز ئاشوربانیپال توانی شاماش موموکینی برای بشکێنێ و بابلی داگیر کردووە، لە ٦٣٣پ.ز ئاشوربانیپال مردووە « سین شارسیش کۆن » کە بەناوبانگ بووە بە « ساراک » بووە پاشای ئاشور دوای پاشای ئاشورە.

فرائورت پاشای ماد کە لە شەڕێکدا لەگەڵ ئاشوریەکاندا بەشەر هاتبوون کوژراوە، لە جێگایەک نێژراوە، گۆڕەکەی ئەڵێن لە « قیز قەپانە » لە دەراوی شارەزوور لە کەناری سورداش لە نزیک سولێمانی، ئەو جێگایە ناسراوە بە « قیزقەپان » گۆڕەکەی بریتییە لە خانویەک، بنمیچێکی فراوانی هەیە، چەند ئەستونێکی ئەخش کراو هەیە، بنمیچەکەی وەکو داری دارەڕا لەبەرد هەڵگەندراون، بەم جۆرە نووسینێکی بازنگەی تری کە پەیکەرێکی نادەمیزادی لەسەر ئەخش کراوە، لە رۆژهەلاتی کۆندا بە پێی ئەریتی تایبەتی ئەستێرەی زەهر لەوەش ئەچێت ڕواڵەتی ئاناهیتا بوو بێت، دووتاکەکەی تری بە واتە رۆژ و مانگ، وەیان بە بیروڕای « هرتسلفد » ئاهورامەزدا و میترانە. سەرەوەی وێنە

هەلکەندراوەکە بەرامبەر بە پەرستگای ئاگرە، کاهن لای چەپەوە وەستاوە، جلو بەرگی تایبەتی موغەکانی لەبەردایە. بەسەر جل و بەرگەکەیدا بە دەستووری مادی رۆژ هەلات جبەیەکی کردۆتە بەر. جلوبەرگی پاشاکە لای راستەوە، وەک جلوبەرگی موغەکە ئاشکرا نیە، هەردوو کەسەکە، کەمانیان بە دەستەوەیە کە نیشانەی سەرکەوتنە. دوای فرائورت، کیاکسار بووە پاشای ماد و درێژەی بە شەردا. لە سالی ٦١٤پ.ز لەشکری ماد گەیشتە ئارانچا. لەم سالەدا پەیمانێکی بەتین لە نێوان پاشای ماد و پاشای بابل نابوپۆلاسەر کە لە لایەن ئاشوریەکانەوە لە بابل دانرابوو لە ئاشور هەلگەڕابوەوە بەسترا. بۆ بەتین کردنی ئەم پەیمانە، کچی کیاکسار کە ناوی « ئامیتس » بوو درا بە نەبوخزر نەسر »، کوڕی نابوپۆلاسەر. لەشکری هەرسێ لا، ماد و، ئاسکیت و بابل، پەلاماری نەینەوایاندا. لە مانگی ئابی ٦١٢ پ.ز شەڕ لە شەقامەکانی شاری نەینەوا دا گەرم بوو بەشێک لە دیواری شار کە لە خشتی کال دروستکرابوو بەهۆی لافاوی دەست کردەوە رووخا. لەشکر چووە ناوشار و « سین شاریشکون » ساراک، خۆی و ژن و مندالەکانیەوە خۆیان خستە ناو ئاگرەوە و سووتان. شار گیرا و تالانکرد. ئیمپراتۆریەتی ئاشور کە زیاد لە پێنج سەد سال فەرمانڕەوا بوو، لە نووسینی پاشاکانیادا کە بە نووسینی میخی نووسراوە وە زۆر شانازیان بە کوشتن، سووتاندنو تالانکردن، کەولکردنی مرۆڤ بە زیندویەتی، سەربڕینی خەلکی، ڕاگوێزان، مندال سوتاندن بە کۆمەل،کردووە ئەمانەش زیاتر دژی مادەکان، کردوویانە... ئاشوریەکان لە ئاسیادا ناویان سڕایەوە.

**ماد:** بەو خاک و سەر زەمینە مێژوویەیان ووتوە کە لە سەردەمی کۆندا، لەسەرەوە بە ڕووباری ئاراس و لوتکەکانی ئەلبورز « خوار دەریای خەزەر » لە رۆژهەلاتەوە بە دەشتە شۆرەکانی کویر. لە رۆژئاواو خوارەوە بە زنجیرە چیای زاگرۆس دەورە دراوە. خاکی ماد لە ڕووی جوغرافیا و

شوێنی نیشتەجێی کۆمەڵە نژادەکانی سەرزەمینی ماد
لە هەزارەی سێیەمی پێش زاینی دا

میژوودا ئەکرێ بە ٣ بەش:

**بەشی یەکەم:** پێی ئەڵێن بەشی رۆژئاوایان « مادی ئاتروپاتین » لە ژووری رووباری ئاراسەوە تا کێوی ئەلوەند درێژ بۆتەوە. هەروەها ناوچەی دەریاچەی ورمێ و رووباری « جەختو » و ئەگرێتەوە، وە رووبارەکانی تر کە شان بەشانی ئەرژێنە دەریاچەی ورمێوە، هەروەها ناوچەی دەراوی رووباری قزلئوزون « رووباری سپی » کە لە کێوی «ئەلبورزی لە نزیک شاری « رەشت »ی ئێستاوە لەتکردووە و ئەرژێتە دەریای خەزەرەوە ئەگرێتەوە سەرانسەری ئەم ناوچەیە ئەکەوێتە ناوچەکانی ئازربایجان ، کوردستانی ئێرانەوە، ئەو زنجیرە چیایەی هەموو داپۆشیوە، لەسەرەوە تا خوار وەیان لە ژووررووی رۆژئاواوە بۆ خواری رۆژهەڵات درێژ بۆتەوە، بەشی رۆژئاوای « مادی ئاترۆپاتین » بە پانای ١٠٠ کیلۆمەتری لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس» گرتۆتەوە.

**بەشی دووەم ماد** : مادی بچووک سەر زەمینێکی پڕ لە گردوو تۆپۆڵکە بوو، کەوتبوە نێوان دوو ریزە چیاوە، لە لای ژوورەوە لکا بوو بە چیای ئەلبورزەوە، کە لە خوارەوە بۆ سەر دەریای خەزەر درێژبۆتەوە، بەرزترینیان کێوی دەماوەند، لە خوارەوە ریزە کێوی رود کە بە درێژای زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لە ژووررووی رۆژئاواوە تاکو خوارووی رۆژهەڵات درێژبۆتەوە، ئەمانە سنووری مادی بچووکی دیاری ئەکرد، لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئەم ناوچەیە دەشتە شۆرەکان هەن.

**بەشی سێیەم پارتاکنا**: پارتاکنا کەوتۆتە نێوان دوو ریزە چیای بەرامبەر بەیەک لەسەرەوە کێوی رود، لە خوارەوە ریزە چیایەک کە بەستراون بە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسەوە، پارتاکنا سروشتی وەک مادی بچوک بوو، مادی کۆن لە لای ژووررووی رۆژئاواوە لەگەڵ نورارتۆ « دوای لەگەڵ ئەرمەنستان » و لای ژوورەوە لەگەڵ ئەلبانی هاوسنوور بوون، بە

درێژایی کەناری دەریای خەزەر، لەو دیوی و کێوی ئەلبورزەوە ناوچەیەکی گەرمەسێرە، ناوچەی کاسپی و کادووسی و گل و ووردە هۆزەکانی تر، کە ئێستا پێیان ئەڵێن تالش و گیلان، ئەمانە لای سەرەوەی خاکی مادیان دیاری ئەکردو لە رۆژهەڵاتەوە چیای کۆپێتداغ، خاکی مادی لە ئاسیای ناوەراست جیا ئەکردەوە، بەشی کەنارەکانی ئەو دەریایە و دەراوەکانی رووباری گورگان و ئەترک هیرکانیان پێ ئەوتن، ئەختێک لەو بەرەو خوارتر، کیشوەری کوێستانی پرسیدی کۆن و لە لای خوارەوە لەگەڵ پارتاکنا هاوسنوور بوون، لە خوارووی رۆژهەڵاتیشەوە، بە دەراوەکانی رووباری کاروون و کرخەوە لکا بور لە نێوان دامێنەکانی چیاکانی زاگرۆس دایە، ئەم شوێنە هەمان ئیلامی کۆن بووە، لە لای رۆژئاواوە خاکی ماد لەگەڵ ئاشوریەکاندا هاو سنوور بوون، جوگرافیای ماد بەم شێوەیەی خوارەوە بە کورتی:

١- مادی ئەترۆپاتین، لە ڕووباری ئاراسەوە تا کێوەکانی ئاگریداغو قەرەداغ و ناوچەی شارەکانی ئێستا قتور و خۆی و مەرەند کە ئاشوریەکان پێیان ئەوت، سانی گی بوتور.

٢- دەراوی رووباری قەرەسوو، بەشی خوارووی ئاراس.

٣- ناوچەی دەریاچەی ورمێ و ئەو رووبارانەی ئەرژێنە ناو ئەودەریاچانەوە، ئەمەش ٣ بەشی:

أ- کەناری دەریاچەی ورمێ، واتە گلیزانی کۆن.

ب ـ کەناری خوارووی دەریاچەی ورمێ، ڕووبەری ڕووباری جەختو و ئەو ڕووبارانەی کە شان بە شانی ئەودا ئەڕۆن، لە سەدەی ٩ی پ.ز ناوی زموا/ی ناوخۆ بووە لە دوایشدا دەوڵەتیماننا لەو ناوچەیەدا دامەزرا، لە دوای سەدەی حەوتەمی پ.ز ئەتوانین بە مەڵبەندی ئابووری مادی دابنێین، لەسەرەتاوە بنکەیەکی ئابووری سەرانسەری کیشوەری ماد بووە، لە دوایدا

بۆتە بنکەی ئابووری مادی ئاترۆپاتێن.

ج ـ کەناری رۆژهەلاتی دەریاچەی ورمێ، کەناری ژووروو‌ی رووباری ئاجیجی و ناوچەی تەپریزی ئێستا.

٤- دەراوی رووباری قزل ئوزون، رووباری سپی، و لقەکانی.

٥- بەشی سەرووی رووباری زێی بچوک، هەروا ئەوسەر زەمینانەش کە کەوتبوونە رۆژئاوایەوە، ریزەچیا درێژە کشاوەکان بە لای ئاشور و بابل دا ئاوەرۆکەیان بوو.

٦- دوو ناوچەی زاموا و پارسوا کە دەراوەکانی زێی بچووک و دیالە لە کێوەکانی زاگروسەوە، چەند زنجیرە شاخێکیان ئەبڕی.

٧- بەشی ناوەڕاستی ناوچەکانی رووباری سیروان: ئەم بەشە لە نزیک شاری خانەقینەوە بە ولاتی نەتر ناو ئەبرا، لە خوارووی دەراوی سیروانەوە بەشەکانی تری ئەو ولاتە « بیت هەمان » « کامیادان » بوو.

٨- دەراوەکانی بەشی سەرووی رووباری کرخە: ئەم ناوچەیە لە رۆژهەلاتەوە خەتی ئاوبڕی سیروان کرخە، و لە بەشی سەرووی ناوچەی کرخە، دەراوەکانی کانی گاماسیاب و سەیرە و مایدەشت ئەگرێتەوە، بەشی سەرووی کرخە هەمان کیشوەری « ئیلیپی » کۆنە کە لە دوایدا ناونرا بە « ئیلیمائیدا » لە دامێنی ئیلیپی، کە کێوەکانی لورستانی ئێستایە « کاسێت » لەوێدا ژیاون.

### مادی بچووک « خواروو »

أ ـ ناوچەی هەمەدان کە ئەکەوێتە ئەو شوێنەی مادی ئاترۆپاتێن و مادی بچووک تیا بەیەک ئەگەن. ئەم ناوچەیە ٣٢٧٠مەتر لە دامێنی کێوی ئەلوەندەوەیە، ئاوی ئەو بەفرانە ئەخۆنەوە کە لە چیای ئەلوەندەوە دێت. زۆربەی ئەو جۆگا و شیوو لافاوانەی بەشی سەرووی رووباری ئەوەسوو کە بە حەوزی دەریاچەی حەوزی سولتان ناو ئەبرێ لەوانە پێک

دیت، زنجیرەی چیای کوە رود کە کەوتۆتە سنووری مادی بچووک، نەختێک بەلای رۆژهەلاتیەوە دەست پێدەکات، ئەم ناوچەیە بە هێلی ناو بەینی نێوان مادی ئەترۆپاتین و مادی بچووک دابنێن، لەبەر ئەوە ناوەندی ئەم ناوچەیە، شاری هەمەدانی ئێستاو ئەکباتانی کۆنەوە کە بە زمانی ماد « هەنگمتنا » واتا جێگای کۆبوونەوە ئەگرێتەوە، وە پایتەختی ماد بووە.

ب ــ حەوزی دەریاچەی « حەوزی سولتان » و دەریاچەی خۆی و رووباری ئەبهەر چای و قەرەسوو و رووباری قوم. ئەمانە ناوەراستی مادی بچووک بووە. شاری تاران کەوتۆتە دامێنەکانی خوارووی چیای ئەلبورزەوە، لە سەردەمی کۆندا « رەی » یا « رەگ » شارێک بووە لە شارە گرنگەکانی ماد. لە رۆژهەلاتی رەی لە نزیک قەلای بەفرینی دەماوەندا لوتکەیەک هەیە لەسەر رێگای مازندەران « سەرزەمینی کۆنی کاسپیان و گلان و نامردان کە پێیان ئەووت دەروازەی کاسپیان.

پارتاکنا:

دەراوێکی پان و وشکە و کەوتۆتە خوارووی دەشتی کویر لە ژووروروی رۆژئاواوە، بۆ لای خوارووی رۆژهەلات درێژبۆتەوە وە لەلای ژووروروی رۆژئاواوە لکاوە بە ئەکباتانەوە، لەلای رۆژهەلات بەهۆی دەشتەکانەوە لە دەشتەکانی پارس « پرسید » جیا ئەکرێتەوە، لە بەشی ژووروروی رۆژئاوا چەمێک هەیە شاری ئەسفەهان « ئەسپانی کۆن » لە کەناری ئەوچەمەدایەو ئەرژێتە دەریای سوێرەوە، لە رۆژهەلاتەوە ئەوبەری چیاکانی کوەرود دەراوێکی کە هەیە ئێستا پێی ئەلێن ناوچەی « یەزد » ئەم ناوچەیە لە سەردەمی کۆندا زۆربەی جار هەر بە بەشێک لە ولاتی پارس ناسراوە. خەلکی کەنارەکانی رۆژهەلات و رۆژئاوای دەریای کاسپ ــ خەزەر لە رووی مێژووەوە لەگەل مادا پەیوەندیەکی باشیان هەبووە، لە رشووی نەژادەوە یەک بوون، بەشی زۆربەی ئەوان،

## هاتنی عارەب بۆ سەر ئیمپراتوریەتی ساسانی و شەڕ لەگەڵ گەلی کورد دا

سەبارەت بەم هاتنە ناکۆکی زۆر لە نێوان مێژوو نووسەکاندا هەیە، هەندێک بە پیرۆزی دادەنێن و هەندێکی دیکە لە داگیرکردن. لە مێژوونووسەکانیشدا دیسان زیاد و کەمیەکی زۆر هەیە.

**ئایین و باوەڕی کوردان :**

پێشتر باسی دین و باوەڕی کوردانمان کرد لە کۆندا. سروشتیان پەرستووە وەک،رۆژ، مانگ، ئەستێرە... هتد. دوای هاتنی زەردەشت و پێغەمبەری ئەو وە کتێبی ئاوێستای پیرۆز، کوردەکان لەسەر ئەو دینە رۆیشتوون و لاشیان زۆر پیرۆز بووە، ئەم دینەش بە پێی هەندێک لە مێژوونووسان لە سەدەی ٦ی پ.ز تا هاتنی عارەب و داگیرکردنی کوردستان ماوەی . ١٢ ساڵ لەسەر ئەو دینە بوون، بە زۆر کوشتن و سوتاندن و داگیرکردن، دەبێت واز لەو دینەیان بێنن.

د. مسعود گولزاری لە کتێبەکەیدا، کرمانشاهان و کوردستان بەرگی یەکەم، شوێنەوارە مێژوویەکانی ئەسەدئاباد و کەنگاوەر و سەحنە، لە بڵاوکراوەکانی ئەنجومەنی ئاساری میللی ژمارە ١٤٧ تاران ١٩٧٨.

**کورد لە پەیدا بوونی ئیسلامەوە :**

ئیسلامەکان لەسەرەتادا نەیانتوانی رێگایەک بۆ گۆڕینی دینە تازەکەیان بدۆزنەوە، لە سەرتاسەری جێگا کورد نشینەکان. کوردان پاڵەوانانە بەرەنگاری عارەب بوونەوە. دوای ئەوەی مەداین لە ساڵی ١٦ کۆچیدا بە دەستی سەعد کوری وەقاسدا داگیر کرا، یەزدی گوردی سێهەم هەڵهات و خۆی گەیاندە زەهاو، کوردەکان لە کوردستاندا یارمەتیەکی زۆری یەزدی گوردی سێهەمیان دا، پاشان سەعد کوڕی وەقاس، « هاشمی بن عەتەبە بن ئەبی وەقاس » بە ١٢ هەزار کەسەوە ناردە سەر سوپای

ئیران، سوپای ئیران و یەزدی گورد لەوکاتەدا لە ناوچەی زەهاو بوون، لە جەلاولا عەرەبەکان شەڕێکی خوێناویان بەرپاکرد و پاش کوشتن و بڕینێکی زۆر عەرەبەکان سەرکەوتن، پاشان بەسەرۆکایەتی « قعقاع بن عمر » بەرەو زەهاو ڕۆیشت، پاش شەڕێکی خوێناوی و کوشتارێکی زۆر عەرەبەکان سەرکەوتن بەسەر سوپای ساسانیدا، ئەو ناوچەیەش ناوچەیەکی شاخاوی بوو یەزدی گورد کشایەوە بۆ نەهاوەند. لە ساڵی ١٨ک سەعدی کوڕی وەقاس ٣ لەشکری نارده جزیره بە سەرۆکایەتی « عیاض بن غانم » ناوبراو لە ماوەی ١٨ مانگدا شارەکانی سەر زەمینی جزیرەی یەک بە دوای یەکدا گرت، تەنها « عین تمر » نەبێت کە نەیان توانیبیگرن، لە کۆتاییدا شارە کورد نشینەکانی سنجار، نورفە، حەران، دەها، نصیبین، رەقە، ماردین، دیاریەکر بەدەستی عیاض گیران وە دوای ئەوەش لەشکرێکی نارده سەر مەلاتیە و ئەوانیشی داگیرکرد. لە ساڵانی ١٨-٢٣ک لەشکری عارەب بە سەرۆکایەتی « عەزمره بن قیس » بەرەو شارەزوور ڕۆیشتن، کوردەکان پاڵەوانانە بەرەنگاریان وەستان و کوشتارێکی زۆریان لە عارەب کرد و ناچاربا عارەبەکان پاشەکشەیان کرد و کشانەوە.

لە ئەوازیشدا کوردەکان دلێرانە بەرامبەر عارەب وەستان، عومەر ناچار بوو لەشکرێکی گەورەتر بە سەرۆکایەتی « عەتبە بن فرقد السلمی » رەوانەی شارەزوور « سامغان » بکات دوای شەڕێکی گەورەو خوێن ڕشتنێکی زۆر لە هەردوو لا شارەزوور گیرا بە فەرمانی تایبەتی عەتبە زۆر بێ بەزەییانە لەگەڵ کوردەکاندا رەفتاریان دەکرد و لەسەریان ئەدان

بلازدری نووسیویەتی « عەتبە » لە موسڵدا بە فەرمانی عومەری خەلیفە خاکی کوردەکانی داگیر کردوو قەڵاکانی تێکدان، کوردەکان دلێرانە لە پێناوی پارێزگاری خاکی خۆیاندا شەڕیان لەگەڵ عارەبدا کردووە

و زۆریان لیّ کوشتوون ئەمڕۆش لە کوردستاندا لە « هەورامانی لهۆن » وە « هەورامانی تەخت » وە لە قەلاْدزیّ و لە چەند جێگایەکی دیکەی ناوچەی سلێمانی و هەولێر، گۆڕستان هەیە بە ناوی گۆڕستانی دۆڵی کافران و دۆڵی ئەسحابەکان، دۆڵی کافران بە گۆڕستانی کوردەکان دەڵێن!

سلمە بن قیس الاشجعی، شەڕی لەگەڵ کوردەکانی ناوچەی « ماسەبزان » و « سمیرە » لە لورستاندا کردووە لەم شەڕەدا هەرچەندە زۆر لە عارەب کوژراوە، بەهۆی زۆری لەشکرەکەیانەوە عارەبەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. لە ساڵەکانی هەژدە وە بیست و سێ ک.ق « جارود عەبدی » بۆ داگیرکردنی ناوچەی دارابگرد و نشار ئەهواز رۆیشتووە و تووشی شەڕێکی گەورە بووە دلێرانە کوردەکان و ئێرانیەکان بەرەنگاریان بوونەتەوە، پاش شەڕێکی خوێناوی پاش ئەوەی عارەبەکان ناو دارابگردیان داگیر کرد، لە داخی ئازایەتی کوردەکان بەزەییان بە ماڵو منداڵیان نەهاتۆتەوە، زۆر دڵڕەقانە لەگەڵیاندا جوڵاونەتەوە بە کوشتن و سووتاندن. پاشان لە ساڵی ٢٥ک.ق کوردەکانی لەژێر فەرمانی عارەبەکاندا دەرچوون، خوزستان و فارس بۆ رزگاربوونیان لە ژێر دەستی عارەبدا شۆڕشیان بەرپا کردووە، لە ساڵەکانی ٢٠ و ٢٢ی خەلافەتی عومەر دا مەرزەبانی ئازربایجان دووچاری هێرشی لەشکری عارەب بوو بە سەرۆکایەتی « حذیفە بن الیمان » وە « مغیرە بن شوعەبیە » بوو کە هەردوو سەرکردەی سوپای عارەب بوون، شەڕێکی خوێناوی لە نێوانی ئەوان و مەرزەبانی ئازربایجان لە دەوروبەری ئەردەبیل ڕوویدا، پاشان رئاوێژکراو پێک هاتن مەرزەبان لە پێناوی رزگار بوون لە کوشتن و تالاْن و سووتاندن و وێرانکردنی « ئاتەشگە » کان لە شارەکانی کورد نشینی ساتروان و بلاسنجان و سبلان بۆ ئەم مەبەستە هەشت سەد هەزار درهەمی دا بە لەشکری عارەب.

دیسان له فەرمانڕەوای عوسمان و عەلیدا، هەر شەڕوشۆڕ بووە، له زۆر جێگا کوردەکان دژی داگیرکەرانی عارەب شۆڕشیان کردوەو سەرکوت کراوون. بەم شێوەیە تا فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەمەویە و عەباسیەکان، کوردەکان شۆڕشیان کردو، لەپێناوی ئازادی و سەربەستیدا بە شێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە لێدراون. حسێن حوزنی له کتێبەکەیدا دەڵێ:

کیشوەرگیری غازیانی ئیسلام، له نێوان شەڕی غازیانی ئیسلام و ساسانیدا، کورد بەشێکی زۆر گەورەی له لەشکری ساسانیان له دەست دا بوو « لێرەدا حسێن حوزنی سەرەتای شەڕی ساسانی و عارەب دادەنێت بە ساڵی ٦٤٠ز.» باسی شەڕەکان دەکات، گرتنی تەیسەفون و هەڵهاتنی یەزی گورو، تالانکردن و بردنی ژن و کچ بە دیلی. شەڕی جەلەولا بە ساڵی ١٦ک ٦٣٧ز دائەنێت. لەم شەڕەدا کوردەکان زۆریان لێ کوژرا، هەرچەند بارمەتیش گەیشتە لایان بەڵام شکان. لەگەڵ ئەوەشدا شەڕکەرانی کورد دژی عارەب زۆر ئازا بوون، لەم شەڕەدا سەرداری کوردەکان بە ناوی « میهران » بوو. لەوشەڕەدا عارەب ١٠٠ هەزار ئەسپی مادی و تالانێکی زۆریان دەست کەوت له ساڵی ١٦ک لەگەڵ کوردەکانی شارەزوور دا خەریک بوون.

له ساڵی ١٩ک ٦٤٠ز هورمزانی پاشای خوزستان داوای یارمەتی له کوردەکانی موکریان و ئازەربایەگان و هەمەدان و کرماشان کرد، له شەڕێکی قورس له دزپول، له کوردی موکریان و سێ تیرەی زۆر گەورەی کورد کە کوردی رەوەند، شوول، زەوەدلان، بوون پێکەوە ئابوو زۆر پاڵەوانانە شەڕیان لەگەڵ داگیرکەراندا کرد، کوردی شاهین و گیل بە هاواری هورمزانەوە چوون. ئەوبەخت له شاهنامەی پەهلەویدا بەرگی یەکەم ل: ١٠و١١و٣١ بە درێژی لەوە دواوە، کوردەکان بەهانایانەوە چوون، باسی کوردەکانی شاهین، راوەند، شوول، هەرسین، کەنگاوەر، زۆر دلانوە

گیلی کردووه، باسی جێگاکانیشیان که نیشتمانیان بووه، ئەمەش هۆنراوەکەیەتی بە فارسی:

ز کوردان شاهین و راوند و شول
فراوان بیامد سوی دیزوپول
ز هرسین و کنگاور و زوردلان
یکی لشکر آماده شد از یلان
صف هرمزان را سواران گیل
سوی میسره‌بایه زنجیر پیل
سپهدارشان گیلوی صف شکن
همه کوردی پر زور و شمشیر زن

ئەمەش وەرگێڕانەکەیەتی بە کوردی:

لە کوردە هەڵۆکانی رەوەند و شوول
لەشکرێکی زۆر بێن بەرەو دیزفول
لە هەرسین و کەنگاوەر و زۆردلان
لەشکرێکی ئامادە بوو لە زیلان
ریزی سوارانی هورمزان و گیل
بەرەو میسرەبا زنجیر لەپێنی فیل
سەرکردەیان بوو گیلوی ریز شکێن
هەموو کوردی ئازا و شمشێر وەشێن

بۆ ئەو شەڕە هورمزان کۆمەکی لە کوردان خواست، لە نێوان هورمزان و عارەبدا شەڕێکی گەورە، کوشتارێکی زۆر کرا، لە کورد زۆر کوژران، پاش چەند مانگێک دەورەدان و شەڕی خوێناوی، هورمزان بە دیل گیرا و بۆ مەدینە برا، لە دوای ساڵێک هەر لە مەدینەدا هورمزان بە دەستی ئەبو

حەفسی کوڕی عومەر کوژرا.

شەڕی نەهاوەند ساڵی ٢١ک ٦٤١ز ڕوویدا و لەو شەڕەدا کورد زۆری لێ کوژرا، کوردەکان ناچار بوون پەنا بەرن بۆ شاخە سەختەکان، عارەب کەوتنە دوایان و زۆریان لێکوشتن.

حسێن حوزنی دەڵێت لە ساڵی ١٩٢٩ز لەسەر پارچە هەمبانەیەک ئەم چوار شیعرەمان دەست کەوت، لە مجلەی زاری کرمانجیدا بە درێژی نەشرمان کردبوو:

هورزگان رمان ئاتیران کوژران
هوشان شاردەوە گەورە گەورەکان
زۆر کردنە عەرەب کوردی نەخاپور
گنانە پالە بەشی شارەزوور
ژن و کنیکان وەدیل بەشینان
مەرد ئازاتلین ژروی هەویسنان
رەوشتی زەردەشت مایەوە بێ دەس
بەزی کاناکا هورمز وەهیچ کەس

ئەم چەند پارچە هۆنراوەیە شەڕی کورد و داگیرکەرانی عارەب باس دەکات کە لە شارەزوور ڕوویداوە.

لەمێژوونووسەکان وەک رەشید یاسەمی دەڵێت: ئەگەر ئەوپارچە هۆنراوەیە لە کاتی هاتنی عارەبدا نەبوو بێت پاش ئەوانیش نووسرابێت دەربڕینی نارەزایی کوردانە بەو داگیرکردنە، بەشێوەیەکی دیکەشە، هۆنراوەکە:

هۆرمزگان رمان ئاتران کــوژران
ویشان شاردەوە گەورەی گــەوران
زورکار ئەرەب کــــــردنە خاپور
گنـــای پالــە هــــەتا شارەزوور
ژن و کنیکان و دبـــل بشــــینا
میـــرد ئازا تلیـــوە روی هونیا
رەوشتی زەردەشت مانوە بیٰ کەس
بزیکا نیـــکا هورمز و هیوچـکس

هۆنراوەکە هەردووکیان لە ناوەڕۆکدا وەک یەکە، لە باسی هاوار و گلەییدا بە کرمانجی خواروو بەم شێوەیە:

مزگەوتەکانیان ڕووخاند و ئاگرەکانیان کوژاندەوە
پیـــاوەگــــەورەکان خۆیـــان شـــــاردەوە
عــــارەبــــە زۆردارەکان کاولیـــــــان کرد
لـــــە بناری پالــــەوە هەتا شـــــــارەزوور
ژن و کچــــەکانیــــان بــەدیلـــــــــی بردن
کــــــوڕی ئازاش لـە خوێنـــــنا تلایــــــەوە
ڕەوشـــــتی زەردەشـــــــــت بێکەس مایەوە
ئیتــــــر هورمز بەزەیی بەکـــــــەس نایەتەوە

مێژوونووسەکان باسی زۆر لەو هێرشەی عارەبیان نووسیوە، وەک ابن اثیر، و ، دجلان و تەبەری و زۆری کە، هۆنراوەکە بە نووسینی پەهلەوی بووە، لەهجەکەشی لەهجەی هەورامییە.

لە سالی ١٦ک ربعي بن الافكل و ابن الهرثمە، لە دوای گرتنی

موسلْ، هێرشیان کردە سەر دانیشتوانی کوردەکان لە کێوەکانی ئەو دەوروبەرەدا، هەموو قەلای کوردەکانیان گرت، ئەلێت « ثم فتحت بقیە اعمال الموصل و جمیع معاقل الاکراد و سار الجمیع للمسلمین » نارچەکانی خاپور، هەکاری، ماردین،ئاگری گرت، هەر لەو ساڵەدا هێرشیان بردە سەر کێوەکانی کوردستانی دەوروو پشتی شارەزوور، کەوتنە داگیرکردنیان.

شەڕی ماسپیدان: نازین کوڕی هورمز لە کوردەکان لەشکرێکی رێکخستبوو شاری ماسپیدانی کردبووە جێگای کۆبوونەوەی لەشکرەکەی، لەملاوە ظرار بن الخطاب » بە لەشکرێکی زۆرەوە چووە سەر ماسپیدان و لە دەشتی ماسپیداندا، شەڕ دەستی پێکرد و کوشتارێکی زۆر کرا. نازین بەدیل گیرا،ظرار دەست بەجێ سەری بڕی و لەشکر شکا، دوای ئەوە شەڕ و کوشتار کەوتە لای سیروانەوە.

شەڕی دینەوەر و سەیرە لە ساڵی ۱۷ک. ابوموسا کە لە شەڕی نەهاوەندا سەرکەوتبوو، هەر لەو ساڵەدا چووە سەر دینەوەر، کە شارێکی گەورەی کوردەکان بوو، بە ناچاری پێکهاتن و دینەوەر کەوتە دەست ابو موسا، وە شیروان بە رێک کەوتن لەگەڵ عارەبدا رێکەوت، دوای ئەوەش « سەیرە لە ساڵی ۲۲ک لە نازربایەکان شەڕێکی قورس کرا، کوردەکان زۆریان لێکوژرا. پاش شەر شرێنەکانیان داگیرکرا لەلایەن عارەبەوە.

لە ساڵی ۲۳ک « عزرە بن قیس » چووە سەر شارەزوور کە لەسەر زەهاو بوو نەیانتوانی بیگرن، عارەب شکا و کشانەوە، پاشان عتبە بن فرقد چووە سەر شارەزوور و گرتی.

حسێن حزنی لە کتێبەکەیدا وای نووسیوە: لەشکری عارەب لە باڵەک و کێوەکانی قەندیلدا ٦ هەزار کەسیان بە دووپشک مردن. کوردێکی زۆریش لەو شەڕانەدا کوژران، « دحلان الفتوحات الاسلامیە جلد یەک

لاپەڕە ۱۳۷ ئەڵێت « و قتل خلقا كثيرا من الاكراد »

ساڵی ۲۲ک ساریە بن زینم، لەشکرێکی زۆری بردە سەر کوردەکان لە نساودارابگرد، پاش شەڕێکی خوێناوی، داگیرکران و تاڵان و کوشتنێکی زۆری لێکردن.

ساڵی ۲۲ک ابو موسا چووە سەر ئەو کوردانەی کەلە پیرۆز و، نهرتیژ، ئەهواز و منازر کۆبوبوونەوە، کوشتارێکی زۆری لێکردن.

ساڵی ۲۳ک سملە بن القیس الاجشعي، چووە سەر کوردەکانو کوشتارێکی زۆری لێکردن، هەرچی بەردەستکەوت کوشتیان. دحلان ئەڵێت « قطع النسلي كردن » پاش کوشتن و سوتاندن، تاڵانێکی زۆریان دەسکەوت، پاش ئەوەی بە شەڕو کوشتار زۆربەی زۆری ئەو جێگابانەیان داگیر کرد، کەوتنە ناردنی عارەب بە ماڵ و دەست و پێوەندیانەوە، وە دەستیان گرت بەسەر زەوی و ئاوی ئەو جێگایانەدا، چونکە بەهیچ جۆرێک لە کوردەکان دڵنیا نەبوون، بۆیەچان خەڵکێکی زۆری عارەبیان بە ماڵەوە نارده سەر کوردستان، بۆ نیشتەجێ بوون. کوردەکانیش سەرەڕای کوشتن و تاڵان و بە دیل بردنی کچ و ژنیان، خۆیان کۆکردۆتەوە و شۆڕشیان کردووە وە هەر جاریش خوێنێکی زۆریان ڕژاوە، تاڵان و بە دیل بردن، ناردنی ماڵە عارەبەکان بەردەوام بووە هەتا فەرمانڕەوای ئەمەویەکان و عەباسیەکان. ئەمین زەکی لە کتێبەکەی خۆیدا مێژووی کورد و کوردستان لەم بارەیەوە دەڵێت: لە پەیدا بوونی ئیسلامیەتدا و هەر لە یەکەم جارەوە کوردەکان پەیوەندیان بە ئیسلامەوە کردووە. تێفکرین و دیان کە ئەم دینە تازەیە باشەو بە ئاسانی قبوڵیان کرد.» ئەگەر پەیوەندی بیوایە هەموو ئەو شەڕانە نە ئەکرا و کوشتار و سوتاندن و بەدیل بردنی ژن و کچ ڕووی نەئەدا، لە ڕاستیدا کوردەکان لەسەر دینی زەردەشتی بوون و باوەڕیان بە دینەکەی خۆیان هەبووە، بە زۆر ئیسلام کراون، ئەم ڕاستیە لە هەموو

نووسینەکاندا دەردەکەویت، تەنانەت لە هەوراماندا پاش کوشتن و گرتن و بە دیل بردن بە زۆر ئیسلام کردن تەنها بەدەم ئیسلام بوون و بە دڵ لەسەر دیانەتی زەردەشتی بوون تا ساڵی ۸۰۰ک ـ نووسەر »

زیاتر بۆ روونکردنەوەی هەندێک مێژوویی لەم بارەیەوە رەشید یاسمی لە کتێبەکەیدا کورد و پەیوەستەگی نەژادی و تاریخی او، ئەڵێت : پیرشەهریار « پیر شالیار » یەکێکە لە پیرە روحانیەکانی زەردەشت و « مغ » بووە لە هەوراماندا نامیلکەیەک هەیە پاشماوەی ئەو بە ناوی « ماریفەت و پیرشالیار » ئێستایش جێگای رێزی دانیشتوانی هەورامانە. لە چەند بەندێک پێک هاتووە یەکێک لەم بەیتانە کە هێنی ئەوە:

گوشت جەواتەی پیرشالیار بوو هوشت چەکیاستەی زانای سیمیار بوو

بە واتە گوێ بە قسەی پیرشالیار بدە وە بە نووسینی زانای سیمیار هۆشی بدەرێ. سیمیار رەنگە بە زەردەشتی گوتبێت یان ئاهوامەزدا. وە چەند بەیتێکی دیکەیە بەلاّم تەنها ئەو دوو دێرەمان نووسی پیرشالیار پیری کاتی زەردەشتیە. یەکێکی دیکە هاوچەرخی شێخ عبدالقادر گەیلانی بووە « لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی ک » وە پەیوەندیشی بە عەبدولقادری گەیلانییەوە هەبووە، ناوی خۆی ناوە پیرشالیار و بەو دەڵێت پیر شالیاری دووهەم، گوایە ئەم کتێبە کۆنەکەی پیر شالیاری هێناوە و گۆڕیویەتی بەشێوەیەک لەگەڵ دیانەتی ئیسلامەتیدا بگونجێت دەڵێت دەقە راستیەکەی لە دەستی خەڵکی هەوراماندا هەیە.

لە ساڵی ۸٤۲ک یەکێک بەناوی مەولانا گوشایش، هاتۆتە هەورامان بۆ ئەوەی خەڵکی فێری قورئان خوێندن بکات، ئەم مەلایە چاوی کزو کوێر بووە لە هەوراماندا خەڵک لە رێش سپیەکانی خۆیانیان پرسیوە « قرون

قدیابان مارفەت و پیرشالیاری باد » بە واتە قورنان کزنترە بان کتێبی زانینی پیرشالیار، پیاوە ژیر و ڕیش سپیەکان وەلامیان وابووە: « ماریفەت و پیرشالیاری قەدیا، قورنی هێزێنکە گوشایشە کوری ناوردەنش » بە واتە « ماریفەتی پیرشالیار کزنترە، قورنانەکە گوشایشە کوێر دوێنێ هێناویەتی ».

مامۆستا ئەمین زەکی لە کتێبەکەی خۆیدا باسی ئەو شەڕانە دەکات هەرچەند ئەمە دووپاتە و لە پێشتر نووسیومانە، لە ١٦ک، مارتی ٦٣٧ز لەشکرێک بەسەرۆکایەتی « هاشم بن عەتبە » چووە سەر جەلەولا، بەزدی گورد لە زەهاو بوو قەلاعەی شەڕی لەگەڵدا کردووە، وە زەهاوی داگیرکردووە. لەدوای گرتنی تکریت و لە ساڵی ١٨ک ٣ قوڵ لە لەشکری عەرەب ڕێکخراوە:

١- لە ژێر فەرمانی سهیل بن عدی بەرەو « رەقە ».

٢- دیسان لە ژێر فەرمانی عبداللە بن عتبان بەرەو « نصیبین »

٣- لەژێر فەرمانی حقبە بن ولید بەرەو جزیرە.

نورفە و نصیبین لەگەڵ ماردین گیرا، دیاربەکریش پاش کوشتن و بڕین گیرا. دیسان حبیب بن مسلمە الفهری لە کوردستانەوە چووە سەر مەلاتیەو ئەویشیان گرت.

لە ساڵی ٢١ک عمر عذرە بن قیس لە زەهاوەوە چووە سەر شارەزوور بەڵام نەیتوانی بیگرێت ناچار کشایەوە، پاشان عتبە بن فرقد چووە سەر شارەزوور و پاش کوشتنێکی زۆر لە کوردان داگیری کرد، عارەبەکانیش زۆریان لێکوژرا، دەریشکیش زۆری لەناو بردن. لە نێوان ساڵانی ١٨و ٢١ک لە ئەهواز و ناساو دارا بجرد، کورد لەگەڵ ئێرانیەکاندا دژی عارەب بوونەوە، لەم شەڕەدا زۆر لە کورد کوژرا و زیانێکی زۆری ماڵیان لێکەوت، پاش ئەوەی بەشەڕو کوشتار، ولاتی « کرخا »ی ناوەندی و

بەشی سیمرە و ماسابزان بەسەرزکایەتی « قیس بن سلمە الاشجعي داگیرکرد.

لە سالی ۲۵ک دا لە فەرمانڕەوایەتی « عامل » ابو موسا الاشعري لە بەسرە، دووجار کورد لە ئەهواز و فارسدا شۆڕشیان کردووە.

**تێبینی:**

هەندێک لەوناوانەی کۆن کەلە نووسینەکاندا هاتووە بە تایبەتی ناوچەکانی ماد، وە ناوی ئێستا:

خوبوشکیە: بەشێک بووە لە هۆزی ئورارتویی.

ئورگا ــ سالالی: لە زەهاوی ئێستا لەسەر یەکێک لە لقەکانی سیروان بووە.ئورگا و سالالی بە واتە بیابان و کێڵگە دەگرێتەوە. یان زەوی و زاری کۆمەڵ

گەردەنە هاشمار: سنووری کیشوەری زاموا لە رۆژهەلاتەوە بووە « گەردەنەی پابیتە » بە سنووری رۆژئاوای دا ئەنرا، کەوتبووە نزیک ئەو رێگایە کە لە زابی بچووکەوە ئەچوو بۆ نامار.

زاراوەی « لار »: بە واتە چیا، کە زاراوەی لۆلۆییەکانە.

پارتاکنا شاری گابای: کەوتۆتە پێنج تا سێ کیلۆمەتری ئەسفەهانەوە.

ئارزینتو: بە ناوچەی رەی وە بە هۆزێکیش وتراوە لەوێ.

خالخی: بە ناوچە کوێستانەکانی ژووروی رۆژهەلاتی زامواییان دەووت.

سەرزەمینی پادشای موساسینا، پادشای کیرتارا لە پاشا نشینەکانی تری زاموا بەرەو ژوورتر بوون.

دووروود لالوە « ئیدیر » ناوی لقەکانی سیروانن.

ئالی پی: لورستانی ئێستایە، ئەوقەلایانەش، هەر لەو ناوەدا بوون وەک زامرۆ، ئامرۆ، پارسین دۆ، تیریتو، سوریتو.

خارتیش یان خاریشپی: کەوتبووە سنوورەکانی ژووروی ئیلامەوە.

قەلای مسز: لە ناوچەی مانناپەکاندا بووە.

پاشا نشینی نی نی: مەلبەندێک بووە لە قەلای ئاریز کەوتبوە خوارووی ماننناوە.

سیمنی شالاخ، بیت تمول، بیت ساگی ـ لە نزیک خانەقینەوە بووە وە بە بیت شدی ناوبراون ئەم ۳ قەلایانە بە ناوی خانەوادەکانی نامارەوە خوێندراونەتەوە.

پارسوا: کەوتبوە ناوچەی سەرووی سیروانەوە.

ناحیەی مسو: لەگەڵ ناوچەی هۆزمانناپەکاندا هاو سنوورن، پاشان لەسەر ناوچەی سنووری مانتا، لەسەر سنووری پارسوا ناوبراوە.

قەلای ئیدا: لە ناوچەی ئەردەلاندا بووە.

کێوی کول لار: رشتەی رەسەنی چیای زاگرۆس بووە، لە میلە رەشەکە نووسراوە دەراوی گەورەی خۆبزشکیە بەرامبەر بەم چیایە بووە.

لار: بە واتە چیا « کولار » ناوی یەکێک لە لوتکەکانی چیای زاگرۆسە.

سیبارز: قەلایەک بووە لە کەناری رۆژهەلاتی قزل ئوزون یان نزیک زنجانەوە بوو بێت.

# سەرچاوەکان:

١- کرماشـاهان و کوردسـتان، شوێنەوارە مێژوویەکانی، ئەسعد ئاباد، کەنگاوەر و سەحنە بەرگی یەکەم، دانەری دکتۆر مـسعود گولزاری، بڵاوکەرەوەی ئەنجومەنی ئاثاری میللی ژمارە/١٤٧ تاران ١٩٧٨.
٢- کورد و کوردسـتان واسـیلی نیکیتن.
٣- کورد و کوردستان محمد امین زەکی
٤- میدیا، ئی.م دیاکۆنۆف وەرگێرانی برهان قانع.
٥- العراق في التاریخ کۆمەڵێک مامۆسـتایانی مێژووی عەرەب لە عێراقدا.
٦- ایران در عهد باسـتان و تاریخ اقوام و پادشاهان پیش از الاسـلام دانەری دکتۆر محمد جواد مشـکوري.
٧- دراسـاتي کوردي لە ولاتی « سـۆڤیەت » دانەری دکتۆر جمال رشید احمد.
٨- ریبازی نوێ.ژمارە ١٠ تشـرینی یەکەمی ١٩٨٨.
٩- جوڵانەوەی رزگاری نیشـتمانی کوردسـتان، دکتۆر عەزیز شەمزینی.
١٠- کتێبی شۆرشی کوردسـتانی عێراق بەشی یەکەم لە ئەیلولی ١٨٦١-١٩٦٣ لەلایەن کۆمیتەی بەرگری لە مافەکانی گەلی کورد نووسـینی دکتۆر عیـسمەت شەریف وانلی.
١١- کورد و کوردسـتان و توابع تالیف شـیخ محمدی مەردوخی کوردسـتانی.
١٢- تاریخ ایران از دوران باسـتان تا پایان سەدەی ١٨م دانەری، ن.دیکولوسـکایا، آبوباکوبوسـکی، ای.ب بطروشفـسکی، آ.ب.بلینتسـکی، ل.واسـترویدا. گۆرینی لە لایەن کەریم کشاوەرزیەوە، لە روسیەوە.
١٣- کورد مینۆرسـکی: مارف خەزنەدار لە رووسـیەوە کردوویە بە عارەبی وە لە عارەبیەوە بۆ کوردی حەمە سەعید.
١٤- کوردسـتانی موکریان یان ئاترۆپاتین دانەری حسین حوزنی.
١٥- کوردو پەیوەسـتەگی نەژادی و تاریخی او تالیف رشید یاسـمی.
١٦- کرد در دائرە المعارف اسلام، گۆرینی بۆ فارسی اسماعیل فتاح قازی.

١٧- کوردستان و الاكراد دراسه سیاسیه و اقتصادیه دکتور عبدالرحمن قاسملو.
١٨- سومر و اكاد الدكتور وديع بشور دمشق ١٩٨١.
١٩- اترکنامه تاریخ جامع قوچان دانەری رەمەزان علی شاکری.
٢٠- شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی گێڕانی هەژار.
٢١- پێشەنگ ژماره ٢٠ سالی حەوتەم تەمووزی ١٩٩٠.
٢٢- کردها، ترکها، عربها تالیف سیسل جی ادمونز به فارسی.
٢٣- نزهه القلوب نوشته حمدالله مستوفی باهتمام و تصحیحگاه لیسترانج.